ناوی کتێب: ئەنفال و ئافرەتی کورد
دانانی: عەدالەت عومەر سالح
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٩٤
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
خۆشنووسیی بەرگ: هونەرمەند محەمەد زادە
پیت لێدان: لیزان سامی
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالق
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر
ژمارە (٩٢)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# پێشەکی

کاتێک مرۆڤ لە مێژووی کوردستان ورد دەبێتەوە، زۆر بەچاکی بۆی دەردەکەوێت کە نەتەوەی کورد بەدرێژایی مێژوو دووچاری سیاسەتی قاتوقڕی و چەوساندنەوە و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی بۆتەوە و بەزەریایەک خوێن ئەم ڕێگایەی بڕیوە، ڕاگواستنی بەکۆمەڵ و سیاسەتی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردنشینەکان و تێکدان و ڕووخاندنی گوند و دێهاتەکان و لە دوا قۆناغیشدا کیمیاباران کردنی کوردستان. زنجیرە یەک لەدوا یەکەکانی تاوانی ڕژێمی عێراق بووە کە دەرهەق بەکورد ئەنجامدراوە، وەلێ لوتکە و ترۆپکی ئەم زنجیرە تاوانانە و دڕندانەترین شێوەی قاتوقڕی کوردان ئۆپەراسیۆنی ئەنفالە بەدناوەکانە کە دنیا لێی بێدەنگ بوو، بەڵێ کارەساتێک کە چەند مانگێک لە (شوبات تا ئەیلولی ١٩٨٨) لەبەرچاوی وڵاتانی جیهان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤیش ڕووی دا کەچی هیچ کەس و لایەنێک یان دەزگایەک یاخود ئاژانسێکی دەنگوباسیش باسی لێوە نەکرد. شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ سەر کوردستان و بەکۆمەڵکوژی خەڵکی بێ دیفاع پرۆسەیەکی ستراتیژی داڕێژراوی ڕژێمی عێراق بوو، بۆ (پاکتاوکردنی نەژادی) کورد و سڕینەوەی ناسنامە نەتەوایەتییەکەی بۆیە پێویستە ئەم تاوانە بێ وێنە و بێ هاوتایە - کە بڕواناکەم لەوەوپێش لە هیچ شوێنێک ڕووی دابێت - بخرێتە پاڵ تاوانەکانی جەنگ و تاوانبارانیش بدرێنە دادگای نێودەوڵەتی و مامەڵەی (تاوانبارانی جەنگ)یان لە گەڵدا بکرێت، لەم ڕووشەوە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و دەوڵەتان و حکومەتەکان و دەزگاکانی (UN) و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و خودی ڕاگەیاندنی کوردیش ئەرکی سەرەکی ئەم هەوڵەیان دەکەوێتە ئەستۆ، ئەم کتێبەش بەشداری و هاوکارییەکی ترە بۆ زیاتر ناساندنی ئەم تاوانە بەجیهان و ڕای گشتی کە بەناوی (ئەنفال و ئافرەت)ە، کتێبەکە لە (حەوت بەش) پێک هاتووە، (بەشی یەکەم) سێ بابەتی لە خۆوە گرتووە، یەکەمیان باس لەمان و چەمکی ئەنفال لە

ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە دەکات، دووەمیش خاڵێکی یەکلاکەرەوەیە لە نێوان ئەنفال و جینۆسایددا، هی سێیەمیش کورد و مێژووی جینۆساید ڕوون دەکاتەوە، (بەشی دووەم)ی کتێبەکە تەرخانکراوە بۆ کیمیاباران کردنی شار و شارۆچکەکانی کوردستان کە وەک سەرەتایەک بۆ ئەنجامدانی ئەنفال بووە، (بەشی سێیەمیش) ستراتیژی ڕژێمی عێراق لە ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال دەخاتە ڕوو، لە کاتێکدا (بەشی چوارەم) قۆناغەکانی شالاوی ئەنفالی لە خۆوە گرتووە، کە شەش هێرشی جیا جیا بووە بۆ سەر کوردستان. (بەشی پێنجەمیش) ڕۆڵی ئافرەتی لە کۆمەڵی کوردەواریدا خستۆتە ڕوو، (بەشی شەشەم)ی کتێبەکە باس لە ئامانجی ڕژێمی عێراق لە ئەنفالکردنی ئافرەتدا دەکات و (بەشی حەوتەمیش) کە دوا بەشی کتێبەکەیە باس لە ئەنجام و کاریگەرییەکانی پرۆسەی ئەنفال لەسەر باری کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد دەکات کە ئەویش کراوەتە دوو بەش، یەکەمیان باس لەو ئەخۆشییە دەروونییانە دەکات کە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان دووچاری هاتوون، لە دووەمیشیان ئەو دیاردە و گیروگرفتە کۆمەلایەتییانە دەخاتە ڕوو کە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی زەق لەو کەسوکارانە بەدی دەکرێت، کتێبەکە کۆتایی دێت بەگرنگترین ئەو ئەنجامانەی پێی گەیشتووە لەگەڵ هەندێک لە پێشنیار و ڕاسپاردە بەو هیوایەی جێگای خۆیان گرتبێت و بەدواداچوونیشی لە دوادا هەبێت، لەگەڵ پاشکۆیەکی تایبەت بەهەندێک (بەڵگەنامە و دیکۆمێنت) کە بۆ یەکەم جارە بلاو دەکرێنەوە، وێڕای لیستی سەرچاوەکان بەزمانی کوردی و عەرەبی هەروەها داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر هاتوو هەر کەموکورییەک لە کتێبەکە بەدی کرا، هاوکات بەڕەخنە و تێبینییەکان کتێبەکە بەهێزتر و پوختتر دەبێت، لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم بەشێک لەو ئەرکە ئەتەوایەتییەی کە لەسەر شانمە سەبارەت بەخستنە ڕووی هەندێک لەو زانیاریی و ڕاستیی و ئەو ئەهامەتیی و مەینەتییانەی کە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بەدەستیانەوە دەناڵێنن ئەنجام بدەم، خوای گەورەش پشت و پەنای هەموو لایەک بێت.

*کوردستان - هەولێر بەهاری ۲۰۰۲*

# بەشی یەکەم

## یەکەم: مانا و چەمکی ئەنفال لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە

ڕەنگە چەمک و پێناسەی ئەنفال لە ڕووی زمانەوانی (لغە) و زاراوەییەوە (الاصطلاح) تاوەکو ئێستا لەلای زۆربەی زۆری خەڵک شتێکی نادیار و نامۆ بێت و ناوەڕۆکەکەشی - مەبەست لە بنج و بناوانی ئۆپەراسیۆنەکەیە - ئاشکرا نەبووبێت و بگرە هەر کاتێک ئەم وشە عەرەبییە سەروسەرە باس بکرێت ئەوا دەسبەجێ دیمەنی ئەو دەیان هەزار مرۆڤە کوردە بێ تاوانەمان بێتە بەرچاو کە بەپرۆسەیەکی داڕێژراو و ئەخشە بۆ کێشراو لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە بەچەند قۆناغێکی جیا جیا - کە دواتر باسیان لێوە دەکەین - لەناوبردران.

ئەنفال لە ڕووی زمانەوانییەوە کۆی (نفل)ە بەواتای ( غنیمة) دەستکەوت دێت.[1] کە لە کاتی شەڕ و تالان کردندا بەدەست شەڕکەران کەوتووە، لە ڕووی زاراوەییشەوە ماناکەی زیادە دەستکەوت دەگەیەنێت، ئەویش ئەو ماڵ و سامانەیە کە بەشەڕ لە موشریک و کافران دەسەنرێت، لەم بارەیەشەوە بۆچوونی زانایانی ئیسلام سەبارەت بەواتا و چەمکی ئەنفال ئەوەیە کە «الأنفال هو الغنیمة اي كل نیل ناله المسلمون من اموال اهل الحرب».[2] واتە بریتییە لەو ماڵەی کە لە خەڵکی شەڕکەر دەست موسڵمانان دەکەوێت، کەواتە ئەنفال لە ڕوانگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە ئەو دەستکەوت و سامان و سەر و ماڵەیە کە موسڵمانان بەزەبر و هێز لە موشریک و بت پەرستان و بێ باوەڕان سەندوویانە.

---

(١) خليل بن احمد الفراهيدي، كتاب العين الجزء (٨)، ط٢، مؤسسة دار الهجرة ١٩٩٠، ص(٣٢٥).

(٢) الامام العلامة محمد جمال الدين القاسمي، المسمى محاسن التأويل، المجلد الخامس ط١، دار الكتب العلمية، بيروت لبنان ١٩٩٧، ص(٢٥٣).

ئەنفال ناوی سووردتی هەشتەمی قورئانی پیرۆزە، زۆربەی ئایەتەکانی باس لە شەڕ و جیهاد دژی موشریکەکان و بێ بڕواکانی قوڕەیش دەکات خوای گەورە لە سەرەتای سوورەتەکەدا دەفەرموێت: «یسألونك عن الأنفال قل الأنفال لله والرسول فاتقوا الله واصلحوا ذات بینکم واطیعوا الله ورسوله ان کنتم مؤمنین».[1] واتە دەربارەی ئەنفال پرسیارت لێ دەکەن - مەبەستی لە پێغەمبەرە (د.خ) - بڵێ ئەنفال هی خودا و پێغەمبەرە ترسی خوداتان بێت و کاروباری نێوان خۆتان چاک بکەن و ملکەچی خودا و پێغەمبەر بن ئەگەر ئێوە بڕوادارن. هەر لەم سوورەتەدا خودای گەورە باس لە چۆنیەتی و ڕێگای دابەشکردنی دەستکەوتەکان (غنائم) دەکات کە موسڵمانان لە شەڕدا لەگەڵ بێ بڕواکان و بت پەرستان وەدەستییان دەکەوێت و دەفەرموێت: «واعلموا انما غنمتم من شيء فان لله خمسة وللرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل».[2] واتە بزانن ئەو دەستکەوتانەی کە لە شەڕدا وەدەستتان دەکەوێت پێنجێکی بۆ خوا و پێغەمبەر و خزم و کەس و یەتیم و هەژار و ڕێبوار و نەدارەکانە، چوار بەشەکەی تریش دابەشی سەر جەنگاوەران دەکرێت. دیارە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە تەنانەت بایەخدانی خودی پێغەمبەر (د.خ) بەم بابەتەوە مەسەلەیەکە پێویستی بەوەستان هەیە لە سەری و لە هەمان کاتیشدا شیکردنەوەیەکی زانستی و بابەتیانەشی گەرەکە.

ئەگەر بێت و بگەڕێینەوە بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی (سبب نزول)ی ئەم سوردتە ئەوا بەتەواوی لە بنج و بناوانی نیشەکە دەگەین و چەمکی ئەنفالمان بەچاکی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئاخۆ چییە و ڕیوشوێنی لە چی هاتووە و ناوەڕۆکەکەشی لە چ سۆنگەیەکەوە ئۆقرە دەگرێت؟ (عبادە کوڕی صامت) کە هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) بووە ڕاستی و دروستی بەسەرهات و چیرۆکی ئەنفالمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە چییەوە هاتووە و

---

(1) سورەتی ئەنفال، ئایەتی (1).

(2) هەمان سورەت، ئایەتی (41).

دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) چووین بۆ شەڕی بەدر و کەوتینە بەرامبەر کافران، خودا دوژمنی تێکشکاند و کۆمەڵێک لە موسڵمانان نیشتنە سەریان و بەدوایان کەوتن بۆ ئەوەی زیاتر تێکیان بشکێنن، هەندێکی تر دەوری پێغەمبەریان گرت نەبادا هیچ زیانێکی پێ بگا، کۆمەڵێکی تر کەوتنە دوای ئەو دەستکەوت و پاشماوانەی کە بتپەرستان لە دوای خۆیان جێهێشتبوو گلێریان کردەوە، بەم جۆرە کۆمەڵی موسڵمانان بوونە سێ بەش، دوای ئەوەی دوژمن ڕاوکەرەکان گەڕانەوە گوتیان دەبێ ئەم دەستکەوتانە بۆ ئێمە بێ چونکە دوژمنمان بەزاند و تێکمان شکاندن، ئەوانەش کە لە چوار دەوری پێغەمبەر (د.خ) مابوونەوە مافی ئەو دەستکەوتانەیان بەخۆیان دا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەریان لە مەترسی پاراستووە، کەچی ئەو بەشەی دەستیان بەسەر دەستکەوتەکان داگرتبوو مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە مادام خۆیان دەستکەوتەکانیان کۆ کردۆتەوە تەنها مافی خۆیانە بیبەن). [1]

ئا لەم کەین و بەینەدا لەسەر پاتاڵ و دەستکەوت دابەشکردن سوورەتی ئەنفال کێشەکان یەکلا دەکاتەوە، بەم جۆرە و بەپێی فەرمانی خودا پێغەمبەر (د.خ) دەستکەوتەکانی دابەش کرد.

ڕەنگە هەندێک کەس وای بۆ بچن کە جەنگاوەرانی ئیسلام مافی خۆیان بووە دەست بەسەر ئەو دەستکەوتانە دابگرن و بۆ خۆیانی گڵ بکەنەوە، بەتایبەتی لە کات و بارودۆخێکدا کە موسڵمانەکان لەوپەڕی باری ناهەمواری و هەژاری و بێدەرامەتیدا بوونە و هیچ داهات یان سەرچاوەیەکی دارایی یان بازرگانییان نەبووە کە پشتی پێ ببەستن بۆ ئەوەی یارمەتییان بدات تاوەکو خۆیانی پێ بەهێز بکەن بۆ هەر ڕووبەڕوو بوونەوەیەک کە دووچاری بوونەتەوە بەتایبەتی کە ئەو کات سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی

---

(١) ابو عبدالله محمد بن احمد الانصاري القرطبي. الجامع لاحكام القرآن. المجلد الرابع. الجزء (٨) دار احياء التراث العربي بيروت لبنان. ١٩٦٥، ص(٥-٦).

ئیسلامی بووە، هەروەها بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی لۆژیک و ئایدیایەک بووە دژی بیروبۆچوون و بیروڕای قورەیش و بتپەرستان کە ئەمەش مەسەلەیەک بووە دژی ماددیەت و بنەماکان.

لە ڕاستیدا ئێمە لێرەدا قسە و گفتوگۆمان لەسەر ئەرک و ماف و ڕوبەڕووبوونەوە و دەستبەسەر داگرتن و کۆنترۆلکردن و مەنهەج و تێڕوانینەکان و چەسپاندنی لۆژیکەکان نییە چونکە (ئەگەر مەسەلەکان تەنها و تەنها مەسەلەی ئیسلامی ڕۆحی و سەرکەوتنی لۆژیکەکانی ئیسلام بوایە بەسەر باوەڕە باوەکانی سەردەمی خۆیدا، ئەگەر هیچ گرفت و کێشەیەکی ڕاستەقینە ڕێگری سەرخستنی لۆژیکی ئیسلام نەبوایە، ئەگەر پەرەسەندنی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئەوها ئاسان و ئاسایی بوایە نەپێویستی بەلەشکرکێشی دەکرد کە لەشکرکێشی کراوە، نەپێویستی بەو شەرعییەتەی قورئانی پیرۆز و شەرعی ئیسلام دەکرد کە بەکرۆکی ئەنفال سوپای ئیسلام هان بدەن بۆ (فتوحات) و لە فتوحاتیشدا پاساو بۆ ئەو هەموو کوشتار و تاڵان و ڕێگری و هەڵمەت بردنە سەر قافڵە و کاروانی بازرگانی لەناو خێڵە دەوارنشینە عەرەبەکاندا هەبووە).[1]

لەودوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا (ئەنفال) ئۆپەراسیۆنێکە دژی بێ بڕوا و موشریکەکان ئەنجامدراوە، هاوکات بۆ سەردەمێک بووە کە دەسەڵاتی ئیسلام ئەوەندە بەهێز نەبووە و لە سەرەتای جێگیر بوون بووە ئەویش بۆ خۆ چەسپاندن و خۆ گرتنەوە و دەرباز بوون لە لەناوچوون دەگەڕێتەوە، بەڵام ئاخۆ کاتێک ئەو ئۆپەراسیۆنە بەدناوە بەناوی ئیسلام دژی نەتەوەی کورد بەشێوەیەکی پراکتیکی ئەنجامدرا و گەلی کورد بووە قوربانی ڕقی ڕژێمی عێراق و تاوانێکی ئەوتۆی دەرهەق ئەنجامدرا کە مەحاڵە لە مێژوودا ڕووی دابێت بە چ هەقێک و لە پای چی بوو.؟ تۆ بڵێی نەتەوەی کورد بەبۆچوون و عەقیدەی ئەوان خوا نەخواستە نەتەوەیەکی بەدەر بێت لە ئیسلام تا ئەو

---

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٤).

حوکمە قەرەقوشییەی بەسەر دابنێن؟

ئاشکرایە نزیکەی ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا نەتەوەی کوردی موسڵمان ئایینی پیرۆزی ئیسلامی بەویست و ئارەزووی خۆی هەڵبژاردووە و بەبڕوایەکی پتەو و تۆکمەشەوە لەگەڵ پرانسیپە سەرەکییەکانی ئەم ئایینە هەڵسوکەوتی کردووە و فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر (د.خ) بەبێ سێ و دوو پەیڕەو کردووە، ئەوەتا لە سەردەمی خەلافەتی (عومەری کوڕی خەتاب) (ڕ.خ) کاتێ لەشکری موسڵمانان گەیشتە کوردستان گەلی کورد بەبێ شەڕ و شۆڕ و دوودڵی قەبوڵی ئایینی پیرۆزی نوێی کرد و هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی ڕاستەقینە نییە لەسەر ئەوەی کەوا بیسەلمێنێت کە کوردەکان لەگەڵ لەشکری موسڵمانان کەوتبنە شەڕ و کوشتار و لە ڕووی هێزی موسڵمانان وەستابن، هەروەها نەتەوەی کورد ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاویشی بینیوە لە پتەوکردن و دەوڵەمەندکردن و فراوانکردنی بازنەی شارستانییەت و مەدەنییەتی ئیسلامی لەسەر هەردوو ئاستی زانستی و لەشکرکێشیشدا، ئەوەتە مێژوو زۆر بەڕوونی بۆمان دەگێڕێتەوە و دیاری دەکات کە زانایانی کوردی موسڵمانان لە نموونەی (ئیبن خەلەکان) و (ئیبن سەلاحی شارەزووری) و (ئیبن ئادەم) و دەیان و دەیانی تر چ ڕۆڵێکیان لە بەرەوپێش بردنی زانستەکانی ئیسلامی بینیوە، لەهەمان کاتدا سەرکردەی سەربازی قارەمانی وەک (سەلاحەدینی ئەیوبی) لێ هەڵکەوتووە کە سەربەرزی و سەرفرازی بۆ ئیسلام گەڕاندۆتەوە لە کاتێکدا ئیسلام ژێردەستە و زەلیل بووە، کەچی زۆر بەداخەوە دەسەڵاتدارانی موسڵمانان لەژێر پەردەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە نەتەوەی کوردیان لە هەموو ماف و ئازادییەکی نەتەوایەتی بێبەش کردووە و بەناوی ئایینی ئیسلامەوە کوردیان چەوساندۆتەوە و هیچ دانیان بەبوونی ئەو نەتەوە ستەمدیدەیە نەناوە بەڵکو هەموو کاتێک هەوڵی قاتوقڕکردنیان داوە و هەموو جۆرە شێوازێکی قەڵاچۆکردنیان بەرامبەر بەکارهێناوە و بەهەموو شێوەیەک ویستوویانە

ناسنامەی نەتەوایەتی بسڕنەوە، پرۆسەی بەدی ئەنفالیش دوا تۆپەراسیۆنی بەرفراوانی ئەم قاتوقڕەیە بوو کە دنیا بێدەنگی لێکرد، بۆیە لەم پێودانگەوە زۆر بەدڵنیاییەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوەی ڕژێمی عێراق بەسەر نەتەوەی کوردی هێنا لە درێژەی ئەو زنجیرە شاڵاوانەی بەناو ئەنفال بۆ سەر کوردستان پێچەوانەی مەفهومی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە بۆ ئەنفال چونکە ئەنفال بەواتای ئەو دەستکەوتانە دێت کە جەنگاوەرانی موسڵمانان لەشەڕدا بەدەستی دێنن و دەیگرن کەواتە ئەنفال بریتییە لە ماڵ و سامان و چەک و زەخیرە و ئاژەڵ (زۆر لە ناودارانی مێژووی ئیسلامیش هەن وەک ئیبن وەکیع، محەممەدی کوڕی عەمر، موسەننا، یونس و ئەحمەدی کوڕی ئیسحاق.. تاد، لە خەڵکانی پێش خۆیان بەچەندین پشت دەگێڕنەوە کە ئەنفال بریتی بوو لە کۆیلەی نێر و مێ، دیل و کەلوپەل، تیر و ڕم، شمشێر، ئەسپ و ماین... تاد).[1]

هەروەها ئەو لایەنەی ئەو دەستکەوتانەی لێ دەگیرێت دەبێ کۆمەڵێکی بێباوەڕ و کافر بن بەزاراوەی شەرعی نەک بەگوتەی سەرزاری خەڵک و کاربەدەستان، (لە هەمان کاتدا دەبێ دەستکەوتەکان بەشەڕ و لە مەیدانی شەڕدا و لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە بگیرێن لەلایەن ئەو موسڵمانانەی کە مەبەستیان لە شەڕکردن بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە نەک هێرش کردنە سەر گوندنشینەکانی بێتاوان و تاڵانکردنی ماڵ و سامانیان».[2]

هەروەها زانایانی ئیسلام لە پێناسەی ئەنفال و دەستکەوتەکانی شەڕ بەم شێوەیە دەدوێن، لە کتێبی (صفوة البیان لمعاني القرآن)دا هاتووە کە: (الانفال هي الغنائم المأخوذة من الکفار قهرا بالقتال) واتە ئەنفال ئەو دەستکەوتانەیە کە بەشەڕ لە کافران وەربگیرێت، هەروەها ئەبو هیلال

---

(1) ابو جعفر محمد جریر الطبري، جامع البیان عن تأویل آي القرآن، الجزء التاسع، ط2 شرکة ومطبعة مصطفی البابي الحلبي، 1954، ص (171).

(2) یوسف دزەیی، ئەنفال کارەسات، ئەنجام و ڕەهەندەکانی، چاپی یەکەم، هەولێر، 2001، لاپەڕە (28).

ئەلعەسکەری دەڵێت: (الغنيمة اسم لما اخذ من اموال المشركين بالقتال).[1] واتە دەستکەوت ئەو وشەیەیە کە لە ماڵ و موڵکی بتپەرستان بەشەڕ وەربگیردرێت.

## دووەم: ئەنفال یان قڕکردنی بەکۆمەڵ (جینۆساید) Genocide

دوای ئەوەی ئەم پرۆسە ئەگریسییە بەدناوە دژی نەتەوەی کورد ئەنجامدرا و بەدەیان هەزار مرۆڤ لەبەر چاوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئەنفالکرا و ئێستاشی لەگەڵدابێت هیچ باس و خواستێکیان نییە و شوێن بزرن، وشەی ئەنفال خۆی خستە ناو فەرهەنگ و ئەدەبیات و بڵاوکراوەکان و هاوکات شێواز و قالبێکی ئاسایی وەرگرت بەکارهێنانیشی هەمدیس بووە شتێکی ئاسایی، (ڕووداوی ئەنفال کە وەک جفرەیەکی سەربازیی ڕەسمی لە بەیاننامە گشتییەکان و نووسراو و یاداشتە ناوخۆییەکانی حکومەتدا بەکار دەهات لە ناو عێراق و بەتایبەتیش لە هەرێمە کوردنشینەکاندا زۆر باو و بەخەڵک ئاشنا بوو، کە تەواوی لایەنە ترسناکەکانی مەسەلەکەش ئاشکرا بوو ناوەکە خۆی لە هەست و ویژدانی میللیدا چەسپاند بەزۆری وەک ئەوەی کە هۆلۆکۆستی ئەڵمانە نازییەکان لە هەست و ویژدانی دەرباز بووانیدا کەوتەوە، لەبەر ئەوەی هەردووک چۆن یەک بوون و ترس و سامیشیان لەیەکەوە نزیک بوو).[2]

تەنانەت ڕژێمی عێراق بۆ چەسپاندن و ڕیشاژۆکردنی ئەم وشەیە لە ناخی کورددا هەوڵێکی زۆری دا و وەکو چەکێکی دەروونی بۆ دژایەتی کردن و بۆ ئەوەی ئەم وشەیە لە هزر و بیری تاکی کورد لەیاد نەکرێت

---

(١) ابو هلال العسكري، الفروق في اللغة، ط ٦، دار العربية للكتاب، ١٩٨٣، ص (١٦٤).

(٢) (MEW) میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لە عێراقدا پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، وەرگێرانی سامەندی موفتی زادە، چ١، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٣).

هەڵسا بەناونانی چەندین شوێن و جێگا بەو ناوە بەدەوە هەر وەک «ناوی چەند کۆمپانیا و دەزگا و قوتابخانەی بەئەنفال ناو نا وەک کێڵگە نەوتێک و کۆمپانیایەکیشی کە کاری وشککردنی زۆنگاوەکانی باشووری عێراق بوو، هەروەها دامەزراندنی کەرتێکی تایبەت حزبی بەعس لە کاتی بیردەوری ئەم کارەساتەدا و لە کۆمەڵگای حاجیاواش قوتابخانەیەکی دوا ناوەندی بەئەنفال ناونا».[1] بەڵام ئاخۆ تا چەند بۆ ئێمەی کورد ڕاست و دروستە کە ئەم وشەیە (ئەنفال) وەکو خۆی لە بڵاوکراوەکان و گفتوگۆکاندا بەکاربێنین بێ ئەوەی لە دوای ئەلتەرناتیڤێک بگەڕێین کە گوزارشت لە شاڵاوی قڕکردنی بەکۆمەڵی نەتەوەی کورد بکات، لە کاتێکدا ڕژێم بەمەبەستێکی ئەگریس و چەپەڵ ئەم وشەیەی بەکارهێناوە و وای لە هەست و ئایدیای گەلانی عێراق و وڵاتە عەرەبییەکان گەیاندوە کە شاڵاوی قڕکردنی بەکۆمەڵی گەلی کورد دەخرێتە پاڵ ئەو ئەنفالانەی کە لە سەرەتای دەسەڵاتی ئایینی ئیسلام ئەنجامدراوە دژی کافر و بێ باوەڕەکان. ڕەنگە دەستەواژەی (قڕکردنی بەکۆمەڵ) یان بەواتایەکی تر (جینۆساید) وشەیەکی لەبار و گونجاو بێت بۆ ئەوەی لە شوێنی وشەی (ئەنفال) بەکار بێت، هاوکات ئەنجامدەرانیشی دەچنە خانەی تاوانبارانی جەنگ (مجرمي الحرب)، بۆ زیاتر ناساندنی شاڵاوەکانی ئەنفال وەکو پرۆسەیەکی قڕکردنی بەکۆمەڵی نەتەوەی کورد و نیشاندانی ئەم کردەوە نامرۆڤانەیە پێویست دەکات چەند پێناسە و بیر و بۆچوون لەم بارەیەوە بخەینە ڕووەوە و لە نزیکەوە لە ناوەڕۆکی کردارەکە بگەین.

(middle East Watch) چاودێری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بەشێکە لە ڕێکخراوێکی جیهانی گەورەتر بەناوی چاودێری مافی مرۆڤ (Human Rightswatch) بارەگای سەرەکی لە شاری نیویۆرکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە و لە ساڵی ١٩٩٢ سەردانی کوردستانیان کردووە و گەلێک بەڵگە و دیکۆمێنت و زانیاریان لەمەڕ شاڵاوەکانی

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٢٥).

ئەنفال کۆکردۆتەوە و دواتر لە دووتوێی کتێبێکدا بەناوی (جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد) (Genocide in Iraq The Anfal Cam Paign againstthe Kurds) لە ساڵی ١٩٩٣ بلاوکردۆتەوە. بەم شێوەیەی خواردوە ئەنفال پێناسە دەکات کە (ناوێکە بۆ زنجیرەیەک هێرش و پەلاماری چڕوپڕی سەربازی کە سەرجەم هەشت پەلامار بوو لە شەش ناوچەی جوگرافی جیاوازدا بەڕێوە چوو، فەرماندەیی گشتی عەمەلیاتەکە لە دەست نووسینگەی باکووری ڕێکخراوی حیزبی بەعسدا بوو بنکەکەی لە شاری کەرکووک بوو، لە مارتی ١٩٨٧ بەدواوە لەلایەن عەلی حەسەن مەجیدەوە سەرۆکایەتی دەکرا.[1] بەڵام ئایا ئەنفال یان پرۆسەی قرکردن و بەکۆمەڵکوژی نەتەوەیەک دەچێتە خانەی جینۆسایدەوە؟! بەر لە هەموو شتێک با بزانین وشەی جینۆساید چییە و لە چییەوە هاتووە؟ دەبێ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی چ بڕیار و ڕێککەوتنێکی لەم بارەیەوە مۆر کردبێ؟

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تەعریف و پێناسەی جینۆساید ئەوا ئەم وشە نوێیە بەمانای کردەوەیەکی کۆن بەشێوە نوێ باو و گۆڕاوەوە (modern deve Lop-ment) لە وشەی کۆنی یۆنانی (Gnos) ڕەگەز عەشیرەت و وشەی لاتینی (Cide) کوشتار پێک هاتووە.

ئەم دەستەواژەیە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٣٣ لە کۆنفراسێک لە شاری مەدرید لە لایەن پرۆفیسۆر (ڕافایل لێمکین) (Rafhal Lemkin) بەکار هاتووە و بەنووسینیش لە ساڵی ١٩٤٤دا تۆمار کراوە، ئەو هەلومەرجە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی هاتە ئاراوە و وڵاتانی بەگشتی بەرەو بارێکی دیکەی هەڵسوکەوت و کارکردن لە ڕووی زۆر بابەتی جیا جیاوە برد، دوای ئەوەی نازییەکان قەڵاچۆی جولەکە و ڕۆمانەکانیان کرد و لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕ و دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم وشەیە لە ساڵی ١٩٤٨ لە بەڵگەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەناوی (پەیمانی پێشگری و

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (١٢٦)

تەنبێکردنی جینایەتی جینۆساید (Conven tion on the Prevention and Punishment of the Crimeof Gmocide) ناسـرا کـه ئەویش ڕێکەوتننامەیەکە بۆ قەدەغەکردن و سزادانی تاوانی جینۆساید بەپێی بڕیاری ژمارە (٢٦٧٠) لە ٢٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا لەلایەن کۆمەڵەی گشتییەوە پەسەند کرا و لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٥١دا چووە بواری کارپێکردنەوە، ئەم ڕێککەوتننامەیە پێناسەی جینۆساید وا شی دەکاتەوە کە ئەو کارانەی بەمەبەستی تێکدان و هەڵتەکاندنی گشتی یان بەش بەش ئەنجام دەدرێن دژ بەکۆمەڵێکی نەتەوەیی ئەتنیکی یا ئایینی و شتێ لەم چەشنە.

دیارە ئەم ڕێککەوتننامەیە شێوازێکی یاساییشی بەخۆوە گرت وەکو زاراوەیەکی یاسایی بەکار هێنرا، بەڵام هەموو کوشتار و ڕەشکوژییەکی بەجینۆساید دانەنا، چونکە جینۆساید کوشتارێکی تایبەتییە کە لە ماددەی دووەمی پەیمانەکەدا بەم شێوەیە هاتووە:[1]

جینۆساید بەمانای هەر کام لەم کردەوانەی خوارەوەیە کە بەنییەتی لەناوبردنی تەواو یان بەشێک لە گروپێکی نەتەوەیی و ئێتنی ڕەگەزی یان ئاینی ئەنجام بدرێ.

**یەکەم**: کوشتنی ئەندامانی گروپەکە.

**دووەم**: زیان گەیاندنی جەستەیی بەئەندامانی گروپەکە.

**سێیەم**: بەئەنقەست دانانی گروپەکە لەژێر بارودۆخی وا کە بە بڕاردە تەواوی گروپەکە یا بەشێکی لە باری فیزیکییەوە لەناو ببا.

**چوارەم**: داسەپاندنی ئیجراناتی وا کە مەبەستی پێشگرتن بێ لەزان (منداڵ بوون) لەناو گروپەکە.

**پێنجەم**: بەزۆر ڕاگواستنی منداڵانی گروپەکە.

---

(١) د. ئەمیری حەسەن پوور، بەرەو تێگەیشتن و بەربەرەکانێکردنی ئەنفال، گۆڤاری ئەنفال، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١).

دیاره بەپێی شیکردنەوەی ئەم پێناسەیە تەنها ئەم کوشتارەی کە نیەتی لەناوبردنی گروپێکی نەتەوەیی، ئێتنی و ڕەگەزی و ئایینی بێ بەجینۆساید دادەنرێ، چونکە بۆ ئەوەی کوشتارێک وەک جینۆساید بناسرێ دەبێ بسەلمێندرێ کە بەرپرسانی بەرنامەی جینۆساید نیەتی لە ناوبردنی گروپە قەلاچۆکراوەکەیان هەبووە، بەلام تۆمارکردن و سەلماندنی نیەت (intent) ئەرکێکی گرانە، چونکە بکوژان بەڕاشکاوی نیەتی خۆیان دەرنابڕن تەنیا نازییەکانی ئەلمان نیەتی خۆیان بۆ لەناوبردن و قاتوقڕ کردنی جولەکەکان و ڕۆمانەکان بەوردی و بەڕاشکاوییەوە دەربڕیوە و بەهیچ جۆرێک نکۆلیان لێ نەکردووە، هەروەها، لە سەرەتای پەیمانەکەدا هاتووە کە جینۆساید تاوانێکە دەکەوێتە ژێر یاسای نێو نەتەوەیی و لە دژی گیان و ئامانجی نەتەوە یەکگرتوەکانە و دنیای شارستانییەت مەحکوم دەکا، بێگومان تاوانێکی وا گەورە و تۆقێنەر دەبێت سزاشی بۆ دانرابێ، مادەی سێی پەیمانەکە دەڵێت:(١)

أ- جینۆساید.

ب- پیلان گێڕان بۆ جینۆساید.

ج- هاندانی ڕاستەوخۆ بەگشتی بۆ جینۆسایدکردن.

د- هەوڵدان بۆ جینۆساید کردن.

هـ- هاودەستی لە جینۆسایددا.

ئەو کردەوانەی خوارەوە سزا دەدرێن:

بێگومان هەر جینۆسایدێک تایبەتمەندی خۆی هەیە کە پێویستە بۆ لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە و بۆ بەربەرەکانی کردن و بەرپەرچدانەوەی هێڵە تایبەتی و گشتییەکانی بزانین و لە کێشەکانی ساخ بوونەوەی ورد بینەوە، لە چەند ساڵی ڕابردوودا هەندێک پرۆفیسۆر و پەیوەندیدارانی ئەم بابەتە پێشنیاریان کردووە کە وشەی (گەل کوژی) (Domi Cide) وەک وشەیەکی

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٢).

گشتی بۆ هەموو ڕەشکوژییەک بەکاربهێنرێ و جینۆساید وەک چەشنێک گەل کوژی چاوی لێ بکرێ، کێشەیەکی تر پەیوەندی نێوان پاکتاوی ئێتنی (ethnic Cleaning) و زمـــانکوژی (Linguecide) و کـــواتور کـــوژی (ethnocide) و شێوەی تری لەناوبردنی گروپێک یان گەلێکە.

پاکتـاوی ئێـتنی بریتـیـیـە لە ڕاگوێزتنی بەنەنقەست بەنەزم و بەزەبری گـروپێکی ئێـتنی تایبـەتە لەناوچەیەکی تایبـەت. پاکـتـاوی ئێـتنی یان پاکـتـاوی نفووس (Population) دەکرێ وەک درێژەی جینۆسـاید دابنرێ بۆ لەناوبردنی گەلێک یان وەک بەرنامەیەک بۆ ڕاپێچان و وەدەرنانی.[1]

کـەواتە لەناوبردنی بەنەنقـەسـتی زمـانی گـەلێک و قـەدەغـەکـردنی بەکـارهێنانی لە خوێندندا یان لە نوسین و گـوزارشـتـدا، یان ڕێ پێـنەدانی بلاوکـراوەی (بیـســتـراو، بینراو، خـوێنراو) وەک لە زۆربەی پارچەکـانی کـوردسـتـاندا ئێـسـتـا ڕەچاو دەکرێت، جۆرێکە لە جۆرەکـانی سـیـاسـەتی جینۆساید و دەکرێ بەتیرۆری کلتوریش ناوزەدە بکرێت.

بۆیە لەم ڕوانگەیەوە پێـویـسـتـە زیاتر بایەخ بەهونەر و وێژە بەتـایبـەتی زمـان بدرێت چونکە زمـانی نەتەوەیی ژێرخـانی کـۆمـەڵ و بەڵگەی بوونی نەتەوەیە، هەر وەک جـەلادەت بەدرخـــان لەم بارەیەوە دەڵێت: (نەتـەوە ژێردەست بوونی خـۆی بەدوو شت بەدوو چەک دەپارێزێت، ئایین و زمـان، گەر ئاییـنی هەردوو نەتەوەی سـەر دەس و بن دەس یەک بێ ئەوا زمـان تاکە چەک دەبێ).[2]

چونکە ئەو نەتەوەیەی کـە زمـان و کـەلـتـور و مـێـژووی خـۆی بپـارێزێ و لێکۆڵینەوەی ئەدەبـیـــان لەســەر بکا ئەوا هەســتــیــشــی بەرەو ئازادی و سەربەخۆیی زیاد دەبێ، لەم بارەیەوە مـستـەفا کەمال ئەتاتۆرک لە کۆنگرەی

---

(١) لە گۆڤاری ئەنفال ژ (١)، لاپەڕە ١٣ وەرگـیـراوە (1) Ericmar Kusen Ethnic cleansing' Encyclopedia of Genocide, 1999, p. 12

(٢) گۆڤاری بەربانگ، ژمارە (٨٧) سـالی ١٢، سـتۆکهۆڵم، ١٩٩٣ .

ئەکادیمیای مێژووی تورکدا کە لە ساڵی ١٩٣٠دا بەسترا ڕوو لە ئەندامانی کۆنگرەکە دەکات و ڕاشکاوانە پێیان دەڵێت: (ئایا دەزانن بۆچی ئێمە بەلقانمان لە دەست چوو، بیرکردنەوە لەم کارە شتێکی بەکەڵکە، گەلانی بەلقان، بولگاری، سربی، ڕۆمانی، هەر لە سەرەتاوە پیتی نووسینیان بۆ خۆیان دروستکرد، لێکۆڵینەوەیان دەربارەی زمان و ئەدەبی خۆیان ئەنجام دا، بایەخیان پێدا، زمان و ئەدەب و کەلەپوری خۆیان پێشخست، ئاخافتن و نووسینیان بەزمانی خۆیان کرد، بایەخیان بەزمانی تورکی و فەرهەنگی عوسمانی نەدا، کاتێ بینیان لەم بوارەدا پێشکەوتنیان وەدەست هێنا ئەوا بڕیاریاندا جیا ببنەوە لە عوسمانییەکان و دەستیان کرد بەخەباتکردن).[1]

هەر بۆیە لەم بارەیەوە زانای تورک و دۆستی نەتەوەی کورد ئیسماعیل بێشکچی دبێژیت: (ڕێگەگرتن لە پێشکەوتنی زمان، فەرهەنگ، ئەدەب، فۆلکلۆر، سەرکەوتووترین شێوەی کۆیلەکردنی گەلە).[2]

### سێیەم: کورد و مێژووی جینۆساید:

ئاشکرایە نەتەوەی کورد لە نەتەوە هەرە دێرینەکانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەژمێردرێت و یەکێکە لەو نەتەوانەی کە لەسەر خاکی خۆیدا دەژیت بێ ئەوەی وڵاتێکی سەربەخۆی هەبێ و خراوەتە دۆزێکی ئەوهاوە کە مەبەست بووە ژێردەستییەکی هەتا هەتایی بێت و بێ ناسنامەی نەتەوایەتی بمێنێتەوە، دوژمنانیشی هەر کە بۆیان ڕەخسابێت کەوتوونەتە گیانی و لە لەناوبردن و قاتوقڕکردنی ئەم گەلە ستەمدیدەیە نەوەستاون، بۆیە پێویستە زۆر بەڕوون و ئاشکرایی باری داگیرکراوی کوردستان و بارودۆخی ڕامیاری کۆمەڵایەتی و ئابووری بخرێتە ڕوو و ژێر دەستی و

---

(١) حوسێن محەممەد عەزیز، کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ڕامیاری ڕەخنەگرانەیە، چ (٢)، کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠، لاپەڕە (٩٩).

(٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٩٩).

بەهۆی ئەویشەوە - دوا کەوتوویی نەتەوەیی کورد کە هیچ کاتێک لە دەسەڵاتی ئەو دانەبووە - بۆ هەموو لایەک ڕوون بکرێتەوە و کوردستان بەکۆلۆنیایەکی نێودەوڵەتی بناسێنین کە (یەکێکە لە هەرە ڕووداوە تراژیدیە دڵتەزێنەکان لە مێژووی خۆرهەلاتی ناوەڕاست و جیهاندا لە یەکەم چارەگی سەدەی بیستەمدا ئەنجامدرا و تیایدا گەلی کورد لە پێناو وەدیهێنانی مافەکانیدا کەوتە ناو خەباتێکی بێوچانی مان و مەرگەوە دژی گەورەترین هێزی کۆلۆنیالی جیهانی و هاوپەیمانە ناوخۆییەکانیان».[1]

دیارە مێژووی لەناوبردن و قڕکردنی نەتەوەی کورد دێرینە و هەر لە ڕۆژگاری میدییەکانەوە و چەندین سەدە پێش زایین بگرە تاکو ئەمڕۆ لەلایەن دوژمنانیەوە هەوڵی قڕکردن و تواندنەوەیان بەردەوامە.

ئەوەتە (فارسەکان بەو ناوەوە کە کورد بەشێکە لە نەتەوەی فارس و لەژێر پەردەی پان ئێرانیزم و ئاریزمدا دژایەتی کوردیان کردووە و دەیکەن، بەڵگەی مێژوویی ناو ڕووداوەکانی دەیان سەدە ئەوە دەسلمێنن بۆ نموونە لە سەردەمی هەر یەکێک لە شا ئیسماعیلی سەفەوی، شا تەهماسب، شا عەباسی یەکەم، شا سەفی، نادر شا، ئاغا محمد خان، دەیان هەزار کورد کوژران یان ڕاگوێزران، لە تورکیاش هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانی دوێنێ و تۆرانییەکانی ئەمڕۆ ئەوەی ئەوانە بەکوردیان کرد تا ئەو کاتە هیچ دوژمنێ نەی کردووە، لە سەردەمی مستەفا کەمال ئەتاتورکدا و لە نێوان سالانی ١٩٢٥-١٩٢٧ دا نزیکەی ١٠٠٠ هەزار گوند وێران کران، بەسەدان کەس لە سێدارەدران و دەیان هەزار کەس لە پرۆسەکانی جەنگدا لەناوبردران و سەدان هەزاری تر ئاوارە و دەربەدەر کران و بەرەو ناوچەکانی تورک ڕاگوێزران و زیاتر لە سەد ڕۆشنبیریش خرانە گۆمی وانەوە).[2]

---

(١) ئیسماعیل بیشکچی، کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە ڕێوار ڕەشید، بەرگی یەکەم، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر، ١٩٩٣ لاپەڕە (٦٢-٦٣).

(٢) مەحموود مەلا عززەت، بازنەکانی ملمڵانێی ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد، ج (١)، سلێمانی، ١٩٨٨، لاپەڕە (٨٠-٨١).

لە سوریاش هەردەم تۆکلى لەوە کراوە کە گەلێک هەبێ بەناوی کورد و پارچە زەوییەکیش هەبێ ناوی کوردستان بێت تەنانەت هەمیشە (هەوڵدراوە بۆ ئەوەی هەموو بوونێکی نەتەوەیی کورد بسڕنەوە کە ئەمەش بێگومان جینۆسایدە، بۆیە قڕکردنی کورد بەچەندین شێواز پیادە کراوە، جارێک بەڕێگای پرۆگرامەکانی خوێندن کە گوایە کورد لەسەر خاکی خۆی نازی ئەمەش هەوڵدانە بۆ سڕینەوەی ناسنامەی کورد و دابڕینی لە بەشەکانی دیکەی کوردستان و جارێکی تریش بەهۆی سیاسەتی پشتێنەی عەرەبی و ئەمنی قەومی عەرەب حکومەتی سوری سنووری عێراق و تورکیای لە کورد قەدەغە کرد و ڕایگواستن، ئەمەش بۆ تەعریب و لێکدابڕانی ناوچەکان بوو).[1]

(هەروەها لە یەکێتی سۆڤیەتی ڕووخاویشدا کە دەگوترا هەموو نەتەوە و گەل و کەمینەیەکی نەتەوایەتی خاوەن مافی خۆیان بوون، کورد نەک هەر کۆمار و ئۆتۆنۆمی و مافی ڕۆشنبیری کامل و ڕەسمی نەبووە و بەس، بەڵکو دەگوترێ کە تا دەهات ژمارەی کورد لە جێگەکانی خۆیاندا کەم دەبوونەوە و بڵاوەیان پێدەکرا، کورد لە لوبنان و ئەردەن و ئەفغانستان بەنامۆ و نەبوونی مافی هاوولاتی مامەڵەیان لە گەڵدا دەکرێت).[2]

لەوەوە دەردەکەوێت کە هەر یەکێک لەو وڵاتانەی کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە و بەزۆرەملێی پێیانەوە لکێنراوە، بەپێی بارودۆخ و هەلومەرجی تایبەتی خۆیان کوردیان چەوساندۆتەوە و لە خشتەیان بردووە، دواتریش بەپرۆژەی تایبەتی داڕێژراو لەناویان بردووە.

چونکە ئامانجی دوژمنانی نەتەوەکەمان هەردەم ئەمانی ڕەچەڵەک و

---

(١) د. ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، تاوانی ئەنفال بەرامبەر بەکورد، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ (١٩)، دەزگای ڕۆژنامەنووسی برایەتی و خەبات، هەولێر، بەهاری ٢٠٠١، لاپەڕە (١٥).

(١) مەحمود مەلا عززەت، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨١).

نەژادی کــورد بووە، بەڵام دڕندانەترین شــێــوازی کــوردقــڕان کــە بەر هەرپارچەیەک لە پارچەکانی کوردستــان کەوتبێت ئەوا بەر کوردســتــانی عــێــراق کــەوتووە، ڕژێــمــە یەک لە دوایەکــانی عــێــراق هەر لە ســەرەتای دروســتــبــوونی دەوڵەتی عــێــراقــیــیــەوە تاوەکــو ئەمــڕۆ لە دژایەتیکردن و لەناوبردنی نەتەوەی کورد لەم بەشەی کــوردســتــان نەوەســتــاون (خۆ ئەگــەر خەڵاتێک هەبوایە لە خەڵاتی نۆبڵ بەرزتر و گــەورەتر و بەبەهاتر بۆ کــاری تیرۆر و جینۆساید، ڕەگەزپەرستی، شۆڤێنزم و فاشیشزم، بیەخشرایە ئەوا گومانی تێدا نییە ڕژێمی عێراق پێشی هەموو ڕژێمێکی تر لە جیهان ئەو خەلاتەیان وەردەگرت).[١]

وەڵی گــەورەترین و جەرگــبــڕترین تاوان کە ئەم ڕژێــمــە دەرهەق بەکــوردی ئەنجام دابێت تاوانی بەدی (ئەنفالە) کە جینۆسایدێکە وێنەی لە دنــیــادا نەبوە و نیــشــە، بەڵێ تاوانێــک کــە دنــیــا بێــدەنگی لێکرد، لەم پرۆســە ئەگریسییەدا قڕکردنی کوردان شێواز و قۆناغێکی تایبەتی بەخۆرە گرت، چونکە ناوەڕۆک و شیوەی تاوانەکە و زیانەگیانی و مادییەکانی کاریگەرتر و دڕندانەتر بوو گــەیشــتــە تروپــک، لە ســاڵی ١٩٨٧دا کــاتێ: (عــەلی حەســەن مەجید) دەسەڵاتی موتلەقی ناوچەی باکووری کەوتە دەست و بوو بە سکرتێری گشتی نوسینگەی باکووری حزبی بەعس دەســبەجێ کــەوتە گــیــانی هاوڵاتــیــانی کــورد و بەزنجیــرەیەک لە بڕیاری ڕامــاڵین و فــەرمــانی نیداری پەتی لەمل دانیشتوانی دێهاتەکانی کوردستــاندا جەڕاند و تەنگی پێ هەڵچنین، تەنانەت چارەسەرکردنی کێشەی کوردی بەسەرب‌ڕینی تێکدەران - کــە مەبەستی پێشمەرگــەیە - دانا، پەلامــارەکــانی ســالی ١٩٨٧-١٩٨٩ ئەم خــاســیــەتانەی خــوارەوەی پێشێلکردنی بەربڵاوی مافەکانی مرۆڤیان لە خۆگرتووە.[٢]

* نیعدام کردنی تێکڕا و بەکۆمەڵ و بێسەر و شوێنکردنی دەیان هەزار

---

(١) حوسێن محەممەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣١٦)
(٢) (MEW)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٨-٤٩).

خەڵکی شەڕ نەکەر لەوانە ژمارەیەکی زۆر ئافرەت و منداڵ و هەندێ جار تەواوی دانیشتوانی چەند گوندێک.

* بەکارهێنانی بەرفراوانی چەکی کیمیایی لەوانە گازی خەردەل و دەمارەگاز (GB)، سارین، دژ بەشاری هەڵەبجە و دەیان گوندی کوردنشین و کوشتنی چەند هەزار کەسێک لە خەڵک و بەتایبەتی ئافرەت و منداڵ.
* تێکڕا وێرانکردنی نزیکەی (٢٠٠٠)(*) هەزار گوند کە لە بەڵگەنامەکانی حکومەتدا وا ناویان هاتووە کە (سووتاوە)، (تێکدراوە)، (تەختکراوە)، (پاکساز کراوە) لانی کەمیش دە دەوازدە شارۆچکەی گەورە و مەڵبەندی بەڕێوەبردن (قەزا و ناحیە) هەمان شتیان بەسەر هاتووە.
* تێکڕا وێرانکردنی نیشانە مەدەنییەکان لەلایەن ئەندازیاری سوپاوە لەوانە تەواوی قوتابخانەکان و مزگەوتەکان و بیرەکان و گەلێ دامودەزگا و پێکهاتەی تر لەو گوندانەی بووبوون بەمەبەست و نیشان لەگەڵ ژمارەیەک وێستگەی سانەوەی کارەبادا.
* تالانکردنی ماڵ و سامانی هاولاتییە مەدەنییەکان و ئاژەڵ و ماڵاتەکانیان بەئەندازەیەکی بەر فراوان لەلایەن هێزەکانی سوپا و میلیشیای سەر بەحکومەتەوە.(**)
* گرتنی هەڕەمەکی گوندنشینان لە (ناوچە قەدەغە کراوەکان)(***)

(*) ئەو ژمارەیە (٢٠٠٠) هەزار گوند لە بەڵگەنامەکانی ڕژێمدا وا هاتووە، دەنا لە ڕاستیدا زیاتر لە (٤٠٠٠) هەزار گوند و دیهاتی کوردستان لە ئۆپەراسیۆنەکە وێرانکران.

(**) لە ٦ی نیسانی ١٩٨٧ بەپێی فرمانێکی عەلی کیمیاوی تەواوی تێکدەران مافی خاوەندارێتیان (ملکیە) لە دەست دا. ئەلەجید لە نووسراوێکدا دەنووسێت (بەپێی ئەو دەسەڵاتەی بڕیاری ژمارە ١٦٠ی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٢٦ ی مارتی ١٩٨٧دا پێی داوین بڕیارمان دا سەرۆکی لیژنە ئەمنییەکانی (رؤساء اللجان الامنیە) پارێزگاکان سەرپشک بکەین لە مەسەلەی دەست ·

(المناطق المحظورة) لەگەڵ ئەو ڕاستییەشدا کە ئەم شوێنانە زێد و ماڵ و زەوی خۆیان بووە.

* بەند کردن و دەستبەسەرکردنی دەیان هەزار ئافرەت و منداڵ و خەڵکی بەتەمەن بۆ چەندین مانگ و لە بارودۆخێکی ئەوپەڕی سەخت و ناڕەحەتدا بێ فەرمانی دادوەری و بێ هیچ هۆیەک، لەوە زیاتر کە وایان لە قەڵەم دابوو گوایە هەواو ئاسوودەیی سەر بەنەیارانی کورد بوون، سەدانیشیان بەهۆی بەدخۆراکی و نەخۆشییەوە لێ مردن.
* بەتۆبزی ڕاگواستنی سەدان لە خەڵکی دێهاتەکان، پاش وێرانکردنی ماڵ و حاڵیان لە بەندیخانە بەردانیان و لە ئاوارەیی گەڕانەوەیان ئەم مەدەنییانە بۆ هەندێ جێگە لە کوردستاندا بار کران کە دوور بوو لە شوێن و ڕێی خۆیانەوە و لەوێ سویا تووڕی دان بێ ئەوەی هیچ قەرەبوویەک بکرێتەوە و گەڕانەوەشیان لێ قەدەغە کردن بۆ گوندەکانی جارانی خۆیان و پێچەوانەش سزای مردن بوو لەبار و زرووفێکی ئەوهادا زۆریان لە میانەی ساڵێکی بەزۆر ڕاگواستنیاندا مردن.
* تێک و پێکدانی بنەما و ژێرخانی ئابووری دێهاتی کوردستان.

ئەوەش وای کرد کە بارودۆخی ئابووری کوردستان بەرەو نەهامەتی و ناڕێکی و ناهەمواری بچێت و دووچاری ئیفلیجی ببێت و نەتوانێ خۆی لەسەر پێ ڕابگرێ، بێگومان ئەوەش بووە هۆی بەربڵاو بوونەوەی بێکاری و هەژاری لەنێو کۆمەڵگەی کوردستاندا و ئاسەوارە نیگەتیڤەکانیشی تاوەکو ئەمڕۆ دیار و لەبەر چاون.

---

(*) بەسەرداگرتنی ماڵ و سامانی گوێزراوە و نەگوێزراوەی تێکدەراندا دەبێ لە ماوەی یەک مانگدا لە ڕۆژی دەرچوونی بڕیاری دەست بەسەرداگرتنەوە ئەو کارە ئەنجام بدرێت.

(***) دوای ئەوەی گوند و دێهاتەکان وێرانکران ئەم شوێنانە نەکران بە (ناوچەی قەدەغەکراو) بەکۆتەر و فڕۆکە دەپشکێنران بۆ کوشتنی هەر کەس و ئاژەڵێک کە تیایاندا ببینرێت.

دیارە پرۆسەی جینۆسایدی کورد لەلایەن رژێمی عێراقەوە بەبەرنامە و پرۆگرام بەرێوە چووە و لەلایەن سەرکردەی سوپاکانیشەوە حساباتی ستراتیژی تایبەتی بۆ کراوە، هەروەها رژێم وەک (نازییەکانی ئەڵمانیا کار و کردەوەکانی پەردەپۆش دەکرد و لەژێر گوزارشتی ناسکدا دەیشاردنەوە لەو شوێنانەی کاربەدەستە نازییەکان لە (نیجراناتی راپەراندن) کار و چالاکی تایبەتی و (سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوە لە رۆژهەلات) دەدوان، بەعسییە بیرۆکراتەکانیش لە بارەی (نیجراناتی کۆکردنەوە) و (گەرانەوە بۆ رێزی نیشتمانی) و (سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوە لە باشوور) دەدوان. هەر چەندە هەندێک وای بۆ دەچن کە پرۆسەی ئەنفال بەپێناسەکردنێکی تەسکبینانە دژە یاخیبوونێک بووە کە زۆر لە دەوڵەتان و وڵاتانی سەربەخۆ ئەوە بەرەوا و مافی خۆیان دەزانن کە دژی یاخیبووان بجەنگێن، بەڵام ئەوە هیچ لەوە ناگۆرێت کە لە بنەرەتدا جینۆساید بووە و هیچ هاوبەشییەکیش لە نێوان دژە یاخیبوون و جینۆسایددا نییە (بەخشینی دەسەڵاتی ناناسایی بەعەلی حەسەن مەجید لە مارتی ١٩٨٧دا کاری دژە یاخیبوونی پچرپچری دژ بەکوردی کردە پەلامارێکی تێکدان و وێرانکردن وەک راوڵ هێلبێرگ لە مێژووە بایەخدرەکەیدا سەبارەت بەهۆلۆکۆست تێبینی دەکات و دەڵێت پرۆسێسی وێرانکردن شێوازێکی بنەرەتی چونیەکی هەیە تەنها یەک شێوە هەیە کە دەگونجێ کۆمەڵێکی پەرت و بڵاوی کاریگەرانە پێ تێک بشکێنێ، سێ هەنگاو هەن کە لە پرۆسەکەدا بنەرەتین:

دستنیشانکردن

کۆکردنەوە

لەناوبردن

ئەمە پێکهاتەیەکی نەگۆری بنەمای پرۆسێسەکەیە چونکە هیچ کۆمەڵێک بێ کۆکردنەوە، یان گرتنی قوربانییەکان ناکوژرێن و

قوربانییەکانیش ناتوانرێ بڕبکرێن لە پێش ئەوەدا کە ئەنجامدەری تاوانەکە بزانێت کێ سەر بەکۆمەڵەیەکە.[١]

(1) Raul Hilbergi The Destruction of European Jews (New York: (MEW) لـه Holmesand Meier, 1985 student edition), P. 267.
سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٥) وەرگیراوە.

## بەشی دووەم

### کیمیاباران سەرەتایەک بۆ ئەنجامدانی ئەنفال

گەورەترین و کاریگەرترین چەک کە بەدەست ڕژێمی عێراقەوە بوو بێت بۆ ئەوەی دەنگی کوردی پێ نووساندبێت و لەناوی بردبێت چەکی کیمیایی بووە، کە بەپێی بڕیارە نێودەوڵەتییەکان بەکارهێنانی بەهەموو جۆرێک قەدەغە و یاساوڵغە،(*) بەڵام ئەم ڕژێمە هەر وەک چۆن هەموو کاتێک بڕیارەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پێشێل کردووە و هیچ گوێی پێنەداون لەو مەسەلەیەشدا (کیمیاباران) بەهەمان شێوە گوێی بەهیچ پرانسیپ و بنەمایەکی نێودەوڵەتی نەداوە و لە ئەنجامدانی کار و کردەوە دڕندەکانی دژ بەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و مرۆڤایەتی دریغی نەکردووە، تەنانەت دەسەڵاتداران و گەورە بەرپرسانی ئەم ڕژێمە لە گفتوگۆ و لێداوانەکانیشیان نکۆڵیان لە بەکارهێنانی ئەم چەکە نەکردۆتەوە و بەڵکو شەرعیەتیان بەبەکارهێنانی چەکی گەورەتر و زیاتر کاولکاریتر داوە، ئەوەتە (تاریق عەزیز)ی گەورە لێپرسراوی ڕژێمی عێراق و وەزیری دەرەوەی پێشوو لە کاتی سەردانی شاندی کۆنگریسی ئەمریکی لە بەهاری ١٩٩٠ بۆ بەغدا و ورووژاندنی ئەم بابەتە لەگەڵیدا کە ئایا وڵاتەکەی چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێناوە، زۆر ڕاشکاوانە لە وەڵامدا دەڵێت: (بەڵێ ئێمە چەکی کیمیاییمان دژی ئەو ئەفام و دواکەوتووانە بەکارهێناوە.[١])

عەلی حەسەن مەجیدیش ئەندازیاری کیمیاباران و ئەنفال، بەکارهێنانی

---

(*) بەپێی ئەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەی کە لە ساڵی ١٩٢٥دا ئیمزا کراوە عێراقیش پابەبەندبوونی تەواوی خۆی پێوە ڕاگەیاندووە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بەهەموو شێوەیەک قەدەغەیە.

(١) محمد احسان، كوردستان ودوامة الحرب، دار ئاراس للطباعة والنشر، ط٢، اربیل، کوردستان، ٢٠٠١، ص (٥٩).

چەکی کیمیایی بەڕێگاچارەیەکی زۆر باش و لەبار داناوە بۆ لەناوبردن و قڕکردنی کوردان، ئەوەتە ڕاشکاوانە دەڵێت: (ئەگەر توانیمان دوو لەسەر سێی شوێنەکانیان لێ بگرینەوە ئەوە لە کەلێن و قوژبنی بچووک بچووکدا دەوریان دەدەین و ئەوجا بەچەکی کیمیایی لێیان دەدەین، من تەنها ڕۆژێک بەکیمیایی لێیان نادەم بەڵکو بەردەوام ماوەی پانزە ڕۆژ بەچەکی کیمیایی دەیانکوتم، دوای ئەوە ڕایدەگەیەنم کە هەر کەسێک دەیەوێ بەچەکەکەیەوە خۆی بداتە دەستەوە ڕێگەی پێ دەدرێت ئەو کاتە من یەک ملیۆن لەم ڕاگەیاندنە چاپ دەکەم و بەسەر باکووردا بڵاوی دەکەمەوە، بەکوردی سۆرانی و بادینی و بەعەرەبیش، من ناڵێم ئەمە لەلایەن حکوومەتی عێراقەوەیە و نایەڵم حکومەت تێکەڵی کارەکە بێت، من دەڵێم ئەم لێرەوەیە واتە نووسینگەی باکوور جا ئەوەی حەز دەکات بگەڕێتەوە بەخێربێتەوە، ئەوانی ئەگەڕانەوە دیسانەوە بەچەکی نوێ هێرشیان دەکەمە سەر، من ناوی چەکی کیمیایی نابەم چونکە ئەوە قەدەغەیە، بەڵام دەڵێم بەچەکی کوشندەی نوێ داتان دەڕژێنم)[1]، ئەلمەجید تەنانەت ماڵ و دیهاتەکانی جاش[*] و بەکرێگیراوەکانیشی لەم هێرشانە نەپاراستووە، کە چاو ساغ و پاڵپشتی هێزەکانی سوپای عێراقی بوونە و دەڵێت: (من بەموستەشارەکانم[**] وت ڕەنگە بڵێن ئێمە گوندەکانی خۆمان خۆش دەوێ نامانەوێ چۆڵیان بکەین، من وتم ناتوانم گوندەکانتان بهێڵمەوە

---

(١) MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٦٩).

(*) جاش: جاشولکە یان جاشەکەر، وشەیەکی دزێو و توانج ئامێزە بۆ فەوجەکانی بەرگریی نیشتمانی (افواج الدفاع الوطني) بەکار هاتووە.

(**) موستەشار: ڕاوێژکار، فەرماندەیەکی کوردی خێڵەکی فەوجی جاشە، لە ساڵی ١٩٧٦ تا ١٩٨٢ ڕژێمی عێراق لەژێر ناوی (مەفرەزە تایبەتییەکان) (المفارز الخاصـه) ئەو کوردانەی چەکدار دەکرد بۆ بەگژداچوونەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و کۆنترۆلکردنی گوندە دوورەکان، وەک هاوکارانی سوپای عێراق، پاشان لەگەڵ درێژەکێشانی جەنگی عێراق - ئێران و کزبوونی دەسەڵاتی ڕژێمی

چونکە بەچەکی کیمیایی پەلاماریان دەدەم و بەمەش ئێوە خۆتان و ماڵ و منداڵتان تیادا دەچن).[1]

ئاشکرایە عێراق لە شەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێراندا بەئەندازەیەکی زۆر چەکی کیمیایی و بایلۆجی بەکارهێناوە و لە ئەنجامیشدا دەیان هەزار کەس بوونە قوربانی و سووتەمەنی ئەو شەڕە. لە ساڵی ١٩٨٧دا و لە گەرمەی شەڕی عێراق - ئێراندا کوردستان دووچاری دژوارترین بارودۆخی سیاسی هات، دوای ئەوەی سوپای ئێرانی لە بەرەکانی جەنگی باشووردا بەتایبەتی لە (ڕۆژهەڵاتی بەسرە) و (کەربەلا)دا دووچاری گەورەترین شکستی سەربازی هات و بەدەیان هەزار سەربازی لێ لەناو چوو، هەڵسا بەکردنەوەی بەرەیەکی دیکەی جەنگ لە کوردستان ئەوەش وای کرد کە عێراق بیر لەوە بکاتەوە کە هەرچی هێز و توانای سەربازی هەیەتی بێنێتە کوردستان بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی ئێرانی چاوەڕوانکراو، بێگومان ئەو هەلومەرج و بارودۆخە سەربازییەی کە لە کوردستان گیرساوە و ئەگەری بەرپابوونی شەڕێکی ناوا دژوار تیایدا وای لە ڕژێمی عێراق کرد کە بکەوێتە گیانی هاوڵاتیانی مەدەنی کورد و دەستپێکردنی زنجیرەیەک هێرشی سەربازی بۆ سەریان، کە بێگومان بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کوشندەترین و دڕندانەترین کردار بوو، دۆڵەکانی جافایەتی و شارباژێڕ یەکەم شوێنە لە کوردستان کە ڕژێم بەگوللە تۆپ لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٧ کیمیابارانی کرد، خەڵکی ناوچەکەش دیارە بەر لە ڕووداوەکە زانیویەتیان ناوچەکەیان کیمیاباران دەکرێت،، یەکێک لەوانەی کە لەو کاتەدا لە

---

عێراق بەسەر زۆربەی گوندەکانی کوردستاندا ڕژێم دەستی کرد بەڕێکخستنی شێوەیەکی تری چەکدارکردنی کوردەکان لەژێر ناوی (فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی) یان فەوجە سووکەکان (الافواج الخفیفة) کە ژمارەی چەکدارانی لە نێوان (٣٠٠-١٠٠٠) ئەندامی بەخۆوە دەگرت، فەرماندەکەیان بەناوی (موستەشار)ەوە ناوبانگیان دەرکرد بوو.

(١) MEW سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦٣).

شوێنی بۆردومانەکەدا بووە دەڵێت: نامۆژگاری ئەوە کرابووین کەوا لە حاڵەتی پەلاماردانی کیمیاییدا پەڕۆی تەڕ بدەین بەدەموچاوماندا و ئاگر بکەینەوە یان بچینە ئەو شوێنانەی کاریگەرییان لەسەر کەمە، کە بۆردمانەکە کرا ئێمە ئەماندەزانی ئەوە کیمیاییە، دەنگەکەی وەک دەنگی تۆپبارانی ئاسایی زل نەبوو، بۆنی سێوی گەنیو و سیرمان دەکرد، بۆمبێکی لە ژمارە نەهاتوو بەسەرماندا بارین بەڵام کاریگەر نەبوو. ڕۆژێک دوای کیمیابارانکردنی دۆڵی جافایەتی واتە ١٦ی نیسانی ١٩٨٧ ئەمجارەیان ناوچەی خۆشناوەتی هەردوو گوندی (بالیسان و شێخ وەسان)(*). بوونە ئامانجی هێزەکانی ڕژێم و کیمیابارانکردن، دوای نیوەڕۆی ئەم ڕۆژە پاش ئەوەی گوندنشینەکان لەسەر زەوی و کێڵگەکانیان دەگەڕێنەوە ماڵەوە بۆ پشوودان و پێش خۆر ئاوابوون بەنیو سەعات دەنگی فڕۆکە پەیدا دەبێت و تا دێ و نزیک دەبێتەوە، خەڵکەکە هەندێکیان هەر لە ماڵەوە دەمێننەوە و هەندێکی تریشیان بەپەلە خۆیان دەگەیننە کونە تەیارەکان(**). بەم جۆرە فڕۆکەکان هەردوو گوندەکە بەچەکی کیمیایی بۆردومان دەکەن، ئەوانەی شایەت عەیانی ئەم ڕووداوە بوونە و بەچاوی خۆیان بۆردومانەکەیان بینیوە دەڵێن ستوونی پان و پۆڕی دووکەڵی گەواڵە هەور ئاسای سپی و بۆر و پەمەیی ئاسمانی پۆشیبوو ئەو دەمە لە چیاکانیشەوە شنە بایەکی مەیلە و ساردی لای ئێوارە هەڵی کردبوو بۆنێکی نامۆی لەگەڵ خۆی دەهێنا، کە

(*) بالیسان: گوندێکی گەورە بوو، تا نیسانی ١٩٨٧ نزیکەی (٢٥٠) ماڵ دەبوو نزیکەی (١٧٥٠) کەسی تیادا دەژیا، چوار مزگەوت و قوتابخانەیەکی سەرەتایی و یەکێکی ناوەندیشی تیادا بوو، (١٢) میل لە ڕۆژهەلاتی شەقلاوە دوورە. شێخ وەسانیش گوندێکی بچووکترە لە بالیسان و نزیکەی (١٥٠) ماڵێک بووە و دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەلاتی شەقلاوە، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٨٣دا دۆڵی بالیسان بوو بەناوچەی قەدەغە کراو بەهەموو شێوەیەک ئابلۆقەی خرابووە سەر و هێزی ئاسمانی عێراقیش بەردەوام هێرشی دەکردەسەر.

(**) کونە تەیارە لە شێوەی ژێرزەمین (ملجأ)ی شارستانی ئێستایە بۆ خۆ پاراستن و خۆ حەشاردان لە هێرشی تەیارە گوندنشینەکان بەکاریان هێناوە.

سەرەتا بۆنێکی خۆشی هەبوو وەک بۆنی گوڵ وابوو، بەڵام دوایی بۆنی سێو و سیری لێ دەهات، شایەتی دیکە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە بۆن و بەرامی دەرمانی مێروو کوژی بووە، پیرەژنێکی بەساڵاچووی خەڵکی بالیسان دەڵێت بەجارێک تاریکی داهات و نەمانەدتوانی هیچ شتێک ببینین و کەس کەسی بەدی نەدەکرد و یەک پارچە دنیا بوو بە تەمومژ، لە دواییدا هەموو کوێر و نابینا بووین، هەندێک ڕشابوونەوە، دەموچاو هەموو ڕەش داگەڕاو خەڵکی بەدەست هالاوسانی بەنازاری بن باڵیانەوە دەیان ناڵاند و ژێر مەمکی ئافرەتانیش، لە ئێشێکی سەخت دابوو دواتریش زەرداوێک لە چاو و لووتیانەوە دەهاتەدەر، زۆر لەوانەی کە لە مردن دەرباز بوون بەسەختی تووشی کێشەی بینین بوون و هەندێکیان ماوەی مانگێک زیاتر هەر بەتەواوی کوێر بوون، هەر لە گوندی شێخ وەسان دەرباز بووان باس لە ژنێک دەکەن کە چۆن هەردوو چاوی کوێر بووە و لەو ناوەدا سووڕاوەتەوە منداڵەکەی توند لەباوەش گرتووە و نەیزانیوە کەوا مردووە، ژمارەیەک لە گوندنشینان بەرەو چیاکان هەڵاتن و لەوێ مردن ئەوانی کە لە شوێنی تەقینەوەی بۆمبەکانەوە نزیک بوون هەر بەپێوە گیانیان دەرچووە.(*) ئەوەی شایەنی باسە و هەروەک پزیشکانی مافی مرۆڤ (Physcians for Human Rightsm , loci. cit) دەڵێن: ئەو نیشانانەی گوندنشینەکان دەیگێڕنەوە بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ کاریگەرێتی گازی خەردەلدا دەگونجێ، ئەگەرچی باسی ئەوە هەیە کەوا هەندێ لە قوربانیان کە دەسبەجێ مردوون پێدەچێت بەهۆی بەکارهێنانی دەمارە گازیشەوە بووبێت،

(*) بەپێی ئەو ئامارانەی کە لە ئەنجامی کیمیابارانکردنی دۆڵی بالیسان و شێخ وەسان و گوندە دراوسێکانی خەمڵێنراون وا مەزەندە دەکرێت کە لە بالیسان (٢٤) کەس کوژرابن و لە گۆڕێکی بەکۆمەڵی گوندەکەدا نێژراون لە گوندی شێخ وەسانیشدا (١١٠) کەس کوژراون کە زۆربەیان منداڵن و نزیکەی (٦٦) کەسیش بریندار و بێ سەروشوێن کراون، بڕوانە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژ (٦٩١) ١٩٩٢/٤/١٧ .

چونکە گازی خەردەل با زۆر خەستیش بێت وا زوو کوشندە نییە، تا لانی کەم دەبێ نیو سەعاتی بەسەردا تێپەڕێت.

دوا بەدوای هێرشەکانی سەر دۆڵی جافەیەتی و شارباژێڕ و دۆڵی بالیسان ڕژێم تەنها بەوە نەوەستا بەڵکو بازنەی پەلامارەکانی فراوانتر کرد و هێرشەکانی قوڵتر کرد، لە ٧ / ٥ / ١٩٨٧ بەفڕۆکە و ڕاجیمە و گوللە تۆپ ناوچەکانی (جافەران، سەر کۆڵە قەرەداخ، گوندەکانی بەرگەڵوو، هەڵەدن، یا خسەمەر، سێکانیان) ی کیمیاباران کرد کە زەرەر و زیانێکی نێجگار زۆری لێ کەوتەوە، هەروەها لە ڕۆژی ٢٧ / ٥ / ١٩٨٧ واتە (٢٠) بیست ڕۆژێک دوای ئەم هێرشانە ڕژێم هێرشی کردە سەر دۆڵی مەلەکان و گوندەکانی دەوروبەری کە ماوەی چەند میلێک لە ڕۆژهەڵاتی بالیسان و شێخ وەساندایە، لەم کیمیابارانەدا نزیکەی (٣٠) سی کەس بینایی چاویان لە دەست دا و خەڵکی ناوچەکەش ئاوارە و پەراگەندەی جێگایان بوون.[١]

### کیمیابارانکردنی هەڵەبجە[*] وەک نموونەیەکی جینۆساید

لەدوا مانگەکانی شەڕی نێوان عێراق - ئێراندا و ڕێک لە ١٦ / ٣ / ١٩٨٨ شاری هەڵەبجەی کوردنشین کەوتە بەر درندانەترین شاڵاوی قڕکردنی بەکۆمەڵی ئەم سەردەمە، لە چاو قوچانێکدا و لەبەردەم چاوی

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم هێرشانە بڕوانە MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩ تا ١٦٠).

(*) هەڵەبجە شارۆچکەیەکی کوردنشینی قەڵەبالغ بوو بازاڕێکی بازرگانی گەرمی هەبوو، ژمارەیەک دامودەزگای حکومەتیشی تێدا بوو، ژمارەی دانیشتوانی لەبەر ئەوەی دێهاتنشینێکی زۆری بۆ ڕاگوێزرا بوو لە نێوان ٤٠ تا ٦٠ هەزار کەس زیاتر بوون، بەر لە کیمیابارانکردنەکە ڕژێمی عێراق وەک تۆڵە کردنەوەیەک لە پشتگیری جەماوەری ئەم شارۆچکەیە بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە مایسی ١٩٨٧ هەردوو گەڕەکی کانی ئاشقان و مەزردانەی تەخت کرد. ئەم شارۆچکەیە چەند میلێک لە سنووری عێراق و ئێران دوورە.

هەموو دنیا ڕژێمی عێراق بەجۆرەها چەکی کیمیایی لە نموونەی (خەردەل، سیانید، سارین، تابون، V X) ئەم شارە ئارامەی بۆردومان کرد و بەتەواوی وێرانی کرد، ئەم کارەساتە بێ وێنەیە کوژرانی نزیکەی (٥٠٠٠) پێنج هەزار هاولاتی مەدەنی بێ دیفاع و نزیکەی (٢٥) بیست و پێنج هەزار بریندار و ئاوارە بوونی دەیان هەزاری تری لێ کەوتەوە و ئاسەوارە نێگەتیڤەکانیشی کە لەدوای خۆی جێهێشت تاوەکو ئەمڕۆ بەزەقی ماونەتەوە (کارەساتی هەڵەبجە لەگەڵ ئەوەی کارەساتێکی گەورەیە کە بەسەر گەلی کورد داهات، هاوکات کارەساتێکی جیهانییە و بەتاوانێکی دژی مرۆڤایەتی لەقەڵەم دەدرێت لەبابەتی هیرۆشیما و ناکازاکی، بەجیاوازییەک ئەو کەسانەی کارەساتی هیرۆشیما و ناکازاکیان ئەنجام دا دەوڵەتێکی بیانی بوون، بەڵام ئەنجامدەرانی تاوانەکەی هەڵەبجە لەلایەن کەسانێکەوە بوو خۆیان بەخاوەنی ئەم وڵاتە دەزانی، ئەنجامدەرانی دەسەلاتدارانی ئەو وڵاتە بوون کە خۆیان دەیانگوت هەڵەبجە بەشێکە لەو وڵاتە)[١].

ڕەنگە کۆمەڵێک هۆکاری جیاجیاش هەبووبن کە ڕواڵەتی ئەنجامدانی کارەساتەکە دیاری بکەن، لە سەرووی هەموویشیانەوە سروشتی ڕژێمی عێراقە کە لە ڕواڵەت و بنەچەوە ڕژێمێکی فاشستی دڕندانەیە، ڕژێمێک کە تاوەکو سەر ئێسقان دژایەتی نەتەوەی کوردی کردووە و (لە ڕوانگەیەکی شۆڤینستی ڕەگەزپەرستانەوە دەڕوانێتە مەسەلەی کورد و جوڵانەوە شۆڕشگێڕانەکەی، بۆیە بەگوێرەی ستراتیژێکی دیاریکراو و بەپێی تاکتیک و نەخشە و پلانی ورد و حسابکراو دەیەوێ نەتەوەی کورد لە عێراق لەناو ببات و خاکی کوردستانی عێراق داگیر و تەعریب بکات

(١) مەحموود محەمەد مەحموود، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان، مێزگردی TV گولان لە یادی کارەساتی هەڵەبجە ١٦ / ٣ / ١٩٩٩، هەروەها بڕوانە هەفتەنامەی گولان ژ (٢١٨) ٢٠، ئاداری، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٨).

نیازی نەوەی مەترسی کورد لەسەر پاشەڕۆژی عێراق نەهێڵێ و زەمینەی جیابوونەوە بۆ جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان لە عێراقدا ساز نەبێ بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش گەلێ ئامراز و شێوازی بەکارهێناوە(١).

فاکتەرێکی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ شوێن و جوگرافیای شاری هەڵەبجە و دانیشتوانەکەی کە مێژوویەکی شکۆدار و بەرچاویان لە هەموو ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانە هەبووە کە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بەخۆیەوە بینیوە بەتایبەتی ڕۆڵی خەڵکی ئەم ناوچەیە لە پشتگیری و هاوکاریکردنی شۆڕشی بارزان لە ساڵانی ١٩٤٥ و دواییدا ئەمە جگە لە ڕۆڵی ڕۆشنبیری دانیشتوانی هەڵەبجە، لە هەمووش گرنگتر ئەم شارە بنکەیەکی گرنگی شۆڕشی مەزنی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ بووە کە توانرا ئازاد بکرێ وەک گەلێک ناوچەی دیکەی ئازادکراوی کوردستان، هەروەها ڕاپەڕین و خۆپیشاندانەکانی قوتابیانی هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٨٢ و ١٩٨٧ گەواهی ئەو ڕاستییەن، ئەوەی جێگای داخ و حەسرەتە کە تاوەکو ئێستاش نەتەوەی کوردی دوچاری بێ ئومێدی و پشتگوێخراوی کردووە کڕوکپی و بێدەنگی جیهان بوو سەبارەت بەو کارەساتەوە تەنانەت (ڕژێمەکانی ناوچە و دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاواش نەیانویست خۆیان لێی بکەن یان بەتاوانبار بلێن بەری چاوت کلی پێوەیە، ئەو تۆزەی کردیشیان لەژێر کاریگەری چەند گروپێکی پاراستنی مافی مرۆڤ و چەند ڕۆژنامەنووسێکدا بوو کە ویستیان دنیا ئاگادار بکەنەوە، بۆیە چەند وڵاتێک لە جیاتی ناردنی سەدەها پزیشک و داخوازییەکانی پزیشکی بۆ ناوچەکە، هەریەکەیان چەند برینداریێکی وەرگرت بۆ تیمارکردنیان بەناوی مرۆڤایەتییەوە، ئەمەش بۆ دەمبەستکردنی گەلەکەیان لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە بۆ تاقیکردنەوەی

(١) ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان، چاپی دووەم، ١٩٩٩، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، لاپەڕە (١١٣).

دەرمانییەکان و ناسینی گازە کوشنەکەی ڕژێمی بەغدا بوو، ئەگینا تیمارکردنی چەند کەسێک و وەلانانی هەزارەهای تر دەبێت چ مرۆڤایەتییەک بێت؟!).[1]

وەلێ لە هەمووشیان کاریگەرتر و ناخۆشتر ئەو بێدەنگییە ترسناکەی ولاتانی دەوروبەری بەتایبەتی ولاتانی عەرەبی بەئیسلامی و عەلمانی و ئەتەوەییشەوە بوو کە (تاریکارییەکی تەواویان خستە سەر مەسەلەکە و شۆڤێنییەتی عەرەبی هەموو دەسەلاتی خۆی بەکارهێنا هەموو ئیتجاهاتی فیکری خۆی بەکارهێنا بۆ ئەوەی مەسەلەکە داپۆشن، هەموو ئیتجاهاتی جیهانی عەرەبی ئیسلامی کە ناوەندی بزووتنەوەی ئیسلامین سەرباری ئەوەی ئێران مەسەلەکەی کەشف کرد تێکرای ئیتجاهاتەکانیش کەوتنە پاڵ شۆڤێنییەتی ئەتەوەیی عەرەبی لە پێناوی داپۆشینی مەسەلەکەدا کە ئەمەش خۆی مەسەلەیەکی تایبەتی و زوڵمێکی مێژوویی زۆر گەورەیە لە کورد کراوە زوڵمێکی زۆر گەورەترە لە مرۆڤایەتی و تاوانێکی کۆکوژی بەو شێوەیە ترسناکە و فراوانە داپۆشرا بۆ دوای ڕاپەڕین وەک چۆن ئەنفال بۆ دوای ڕاپەڕین داپۆشرا)[2].

لێرەدا پێویستە دان بەهەندێک ڕاستی بنرێت و هەروەها بەسادەیی بەسەریاندا تێپەڕنەبین چونکە ئاوەژووکردنی ڕاستییەکان دەبێتە هۆی داپۆشین و پەردە خستنە سەر تاوانەکان و شاردنەوەیان. دیارە ولاتە زلهێزەکانی دنیا و بڕیار بەدەستەکان لە یارمەتیدان و هاریکاریکردنی ڕژێمی عێراق هیچ کاتێک کەمتەرخەمیان نەکردووە و بەهەموو شێوەیەک پاڵپشتی بوونە بەڵکو لە کاتی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و دێهاتەکانی تری کوردستانیش جڵەویان بۆ عێراق شل کرد و ورتەیان لێوە نەهات

---

(١) د. ئەحمەد بابەکر میراودەلی، لە گازبارانکردنی هەڵەبجەدا کێ تاوانبارە، گۆڤاری سەرخۆ بوون، ژ (٧، ٨) هاوین و پاییزی ٢٠٠١، لاپەڕە (٣٥).
(٢) هەفتەنامەی گوڵان، ژ (٢١٨) سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١).

ئەوەتە ولیەم والدگریف (Wiliam Waldgrave) وەزیری دەوڵەتی بەریتانی بۆ کاروباری دەرەوەی وڵاتی کۆمنویلس لە وتاریکدا بۆ پەرلەمانی بەریتانی پێش شەڕی دووەمی کەنداو لە ٥ / ٤ / ١٩٩٠دا دەڵێت: (خۆ دابڕین لە عیراق هیچ مومکین نییە، ئەمە شتێکە دڵی موناقیسەکانی ئێمە خۆش دەکات و بێکاری و بێ ئیشی لە وڵاتەکەماندا زیاد دەکات).[1] دیارە ئەم وڵاتانە لە کاتی مامەڵە و ئیش پرانسیپی (لیس هناك في السياسة صديق دائم او عدو دائم بل هناك مصالح دائمة)یان ڕەچاو کردووە و بەرژەوەندییەکانیان لە بەرایی و پێشینەی هەموو کار و هەنگاوێک داناوە، ئەوەتە (چەندین کۆمپانیای ئەمریکایی لە نموونەی Phillip Petoleum USAوKBS یارمەتی عیراقیان دا لە دروستکردنی چەکی کۆکوژی هەر بەتەنیا ئەم دوو کۆمپانیایە لە ساڵی ١٩٨٣ دا بایی (٥٠٠،٠٠٠) پێنج سەد هەزار پاوەند کیمیاییان فرۆشتە عیراق بۆ دروستکردنی ماستەر گاز، هەروەها گەلێک وڵاتانی دیکەش یارمەتی عیراقیان داوە بۆ بەرهەم هێنان و دروستکردنی چەکە کۆکوژییەکان وەک کۆمپانیای M Wlchemie Bv ی هۆڵەندی کە (١٢٠٠) هەزار و دووسەت تەن لەو مادانەی داوە بەعیراق بۆ دروستکردنی چەکی کیمیایی و (٢٠،٠٠٠) بیست هەزار کیلۆ لە Posphoeo ous Tyichlorid یشی پێداوە، کۆمپانیای ئەڵمانی chlore Thly Dime thyamine Thiodiglg col کارگەی چەکی کیمیایی سامەڕای دروستکردووە هەروەها ئەم کۆمپانیایانەی خوارەوەش بەشدارییان لە دروستکردنی کارگەی چەکی کیمیایی لە عەکاشات کردووە کە ساڵانە (٢٠٠٠) دوو هەزار تەن کیمیایی بەرهەم بوو کە ئەمانەن Bebcock & Wilcoxof Britain, monted ison of Italy, Fevost ahl of Germany. Messerschmitt- Bolk- Blohm بەپێی ڕۆژنامەی ئەڵمانی (DynsPigel)ی ڕۆژی ٢٤/٩/١٩٩٠ ئەم کۆمپانیایانە جۆرێک وقودی بۆمبای Fuelair plasic یان داوەتە عیراق کە

(١) گۆڤاری سەربەخۆ بوون، ژ (٧، ٨)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨).

هێزی بۆمبایەکی ئەتۆمی بچووکی هەبووە).[1] ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردن و سەرنجە ئەوەیە کە مێژووی پتەوکردن و بنیادنانی هێزە سەربازی و پرۆسەی میلیتاریزەکردنی عێراق بەشێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹۷۳، بەتایبەتی دوای بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، لەو ماوەیەدا واتە (لە نێوان ساڵانی ۱۹۷۳-۱۹۷۸دا عێراق پارەیەکی ئێجگار زۆری بۆ کڕینی چەک خەرج کردووە هەرگیز بەگوێرەی زیادبوونی ڕێژەی گەشەسەندنی تێکڕای داهاتی ناوخۆ نەبووە، بەهای چەک کڕین لە ۰.۰۵۸ بلیۆن دینار لە ساڵی ۱۹۷۳دا بۆ ۰.۲۰۵ بلیۆن دینار لە ساڵی ۱۹۷۸ زیادی کردووە. ئەمەش ڕێژەی گەشەی ساڵانەی لە ۲۹٪ پێک دێنێت، هەروەها ئەگەر سەیرێکی ئەو چەکە قورسانەش بکەین کە عێراق لە ماوەی نێوان ساڵانی ۱۹۷۲-۱۹۸۰دا بوویەتی دەبینین ژمارەی تانک، فڕۆکەی شەڕکەر، هەلیکۆپتەر، زرێپۆش لە ۹۲۵، ۱۸۹، ٤٨، ٣٦٠وە یەک لە دوای یەک بۆ ۱۹۰۰، ۳۳۹، ۲۳۱، ۱۳۰۰ زیادی کردوە و زۆربەی هەرە زۆری ئەو چەکانەش یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو پێی فرۆشتووە، هەر بۆ نموونە لە ساڵی ۱۹۷۹-۱۹۸۰دا لە کۆی ۱۹۰۰ تانک، ۱۸۰۰یان سۆڤیەتی بوون، بۆیە یەکێتی سۆڤیەت پشکی شێری لە ناردنی چەک بۆ عێراق هەبووە کە ڕێژەی لە ۸۰٪ی پێک هێناوە)[2]. لەم پێوەدانگەوە دەکرێ مەبەستی سەرەکی ڕژێمی عێراق لە کیمیابارانکردنی کوردستان لە نێوان ساڵی ۱۹۸۷ و ۱۹۸۸دا و پیادەکردنی سیاسەتی خاک سووتاندن (الارض المحروقة) لەم خاڵە سەرەکییانەی خوارەوە دابڕێژرێت.[3]

---

(۱) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (۳۸-٤١).

(۲) هیوا تاڵەبانی، بەعس و میلیتاریزەکردنی عێراق، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی سیاسەتی دەولی، ژ (۲)، ساڵی چوارەم، تەمووزی ۱۹۹۵، لاپەڕە (۵-۸).

(۳) MEW، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (۵۸۳-٥٨٤).

**یەکەم:** بۆ لێدان و تێکشکاندنی بنکە و بارەگا سەرەکییەکان و شوێنەکانی کۆبوونەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەگشتی بووە کە ژمارەیەکی زۆری ئەم هێرشانە بۆ سەر دۆڵی جافایەتی (ئەنفالی یەکەم)، ناوچەی قەرەداغ (ئەنفالی دووەم)، دۆڵەکانی بالیسان و سماقولی (ئەنفالی شەشەم و حەوتەم) زێوەشکان (ئەنفالی کۆتایی) ئەنفالی بادینان بوو.

**دووەم:** بۆ پەشۆکاندن و کوشتن و لەناوبردنی ئەو پێشمەرگانەوە کە لە حاڵەتی پاشەکشەدا بوون لە کاتی پەرەسەندن و بەرفراوانی جوگرافیای پرۆسەی ئەنفالدا.

**سێیەم:** ترساندن و تۆقاندن و چاوشکاندنی بەکۆمەڵی خەڵکی مەدەنی لەسەر پشتگیری کردنیان بۆ پێشمەرگە، گەورەترین حاڵەتی لەناکاو و دراماتیکی بۆردومانکردنی هەڵەبجە بوو.

**چوارەم:** بۆ بەرپاکردنی ترس و سام لە نێوان سەرتاپا دانیشتوانی مەدەنیدا و بۆ ئەوەی گوندنشینان و دێهاتییەکان بەیەکجاری ماڵ و شوێنی نیشتەجێبوونیان چۆڵ بکەن و بەم شێوەیەش گرتن و گواستنەوە و کوشتنیان ئاسان بێت، بەزۆری دەستپێکردنی هەر قۆناغێکی پەلاماری ئەنفال ئەم جۆرە هێرشانەی دەگرتە خۆ، بەڵام لە ئەنفالی کۆتاییدا (ئەنفالی بادینان) لە ٢٥ ئابی ١٩٨٨دا لە ناوچەیەکی بەرتەسکدا و لەسەر هێڵێک لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا کیمیاباران بەشێوەیەکی خەستتر ئەنجامدرا.

# بەشی سێیەم

## ستراتیژی ڕژێمی عێراق لە ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفالدا

ئاشکرایە گەلی کورد بۆ دەستەبەرکردنی مافە ڕەواکانی هیچ کاتێک لە خەبات و تێکۆشان سڵی نەکردووە و لەو ڕێگا سەخت و ناهەموارەشدا گەلێک شۆڕشی بەرپا کردووە و کۆمەڵێک قوربانی داوە و خوێنێکی نێجگار زۆریشی ڕشتووە، دیارە ئەو خەبات و بەرخودانەی کوردان بۆ پاراستن و بەرگریکردن لە خاک و وڵات و مۆرکی نەتەوایەتی بووە، بەڵام هەمیشە دوژمنان و داگیرکەران بەوە گەلی کورد و شۆڕشەکەیان تاوانبار کردووە کە گوایە ئەم بزووتنەوانە جیاوازیخوازن و بەکرێگیراوی زایۆنیزم و ئیمپریالزمن و دەیانەوێ خاکی وڵات پارچە پارچە بکەن و سەروەریشی بشێوێنن، ئەمە لە کاتێکدا (مێژووی ناوچەکە تاکە یەک ڕووداو ناگێڕێتەوە لەسەر ئەوەی کورد کەڕەتێ ئەرزی نەتەوەیەکی تری داگیر کردبێ یا دەستدرێژی کردبێتە سەر مافی گەلێکی تر بەڵکو بەدرێژایی مێژوو هەر کورد ئەرزی داگیر کراوە و مافەکانی پێشێلکراوە و دەستدرێژی کراوەتە سەر و نەیان هێشتووە بەو چەشنە بژی کە خۆی نەیەوێ)[1] یەکێک لەو زنجیرە تاوان و دەستدرێژییانە (ئەنفال)ە بەد ناوەکانە کە پرۆسەیەکی داڕێژراوی ستراتیژی ڕژێمی عێراق بوو بۆ لەناوبردن و پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد (التطهير العرقي) کە لەنێوان (مانگی شوبات و ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨) ئەنجامدرا و لە ئەنجامدا نزیکەی (١٨٢) سەد و هەشتا و دوو هەزار مرۆڤ (ژن و پیاو و منداڵ و پیر و لاو) بوونە قوربانی ڕقی ڕژێم و نزیکەی (٤٥٠٠) گوند و لادێی کوردستانیش تەفروتوونا کرا و سووتێندران. بەڵام دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە (جێبەجێکردنی

(١) حوسێن محەممەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٤٧).

جینۆسایدن لە کوردستاندا لەلایەن عێراقەوە بەرامبەر بەڕەگەزی کورد هەر بەتەنها بەهێرشەکانی ئەنفالەوە نەبەستراوەتەوە، ئەگەرچی جینۆساید لەمەیاندا گەیشتۆتە چڵەپۆپە لە چاو مێژووی تازەی گەلی کوردستاندا، سیاسەتی کۆچ پێکردنی زۆرەملێی گوندنشینەکان و وێرانکردنی سەدان لە ماوەی نێوان ١٩٧٦ تا ١٩٧٩ دوو دیاردەی ئاشکرای جێبەجێکردنی جینۆساید کە ڕژێمی عێراق کردوونی، هەروەها دیاردەکردنی کۆچ پێکردنی زۆرەملێی کوردەکانی کەرکووک و خانەقین و شەنگار و شوێنەکانی تر بەمەبەستی بەعەرەبکردنی ئەو ناوچانە، دەرکردن و شوێنبزر کردنی دەیان هەزار کوردی فەیلی لە ساڵەکانی ١٩٧١ و ١٩٧٨ و ١٩٨٩ بەرەو ئێران، بێ سەروشوێنکردنی نزیکەی (٨) هەزار بارزانی لە ساڵی ١٩٨٣دا، تا کیمیابارانکردنی هەڵەبجە لە ١٦ / ٣ / ١٩٨٨دا بەڵگەی واقیعین بۆ تاوانبارکردنی ڕژێمی عێراق بەتاوانی قڕکردنی بەکۆمەڵی ڕەگەزی کورد).[١]

ئاشکرایە کارکردن بۆ گەشەدان بەستراتیژێکی پتەو و تۆکمە بۆ بەدیهێنانی هەر ئامانجێک کارێکی ئاسان نییە، ئەم کارە بەقەد ئەوەی پەیوەندی بەویستەوە هەیە بەقەد ئەوەش پەیوەندی بەهەلومەرجی بابەتییەوە هەیە (داڕشتنی هەر ستراتیژێکیش پێویست بەوە دەکا بۆچوونێکی تایبەت سەبارەت پشت بەستن بەشیکردنەوەی دینامیکە ئیقلیمییەکان گەلاڵە بکرێت، ئەمەش پێویست بەدۆزینەوەی توخمە گۆڕاو و ئەگۆڕەکانی بۆچوونەکە دەکا بێگومان هەر ئەم توخمانەش کۆڵەگەی ستراتیژێکی درێژخایەن پێک دێنن)[٢] لەم ڕوانگەوە ئەگەر مانا و چەمکی ئەلف و بێی ستراتیژ بریتی بێت لە (دەستنیشانکردنی هێڵی گشتی

---

(١) زیاد عەبدولرحمان، تونی مەرگ، هێرشەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامەکانی ڕژێمدا، چاپی یەکەم، تەورێز، ١٩٩٥، لاپەڕە (١٥).

(٢) فەرید ئەسەسەرد، کورد و مەسەلەکانی ئەمنی قەومی، چاپی دووەم سلێمانی، لە بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، لاپەڕە (٨٩).

ڕێکخـــراوێکی دیاریکراو بۆ ســـەردەمـێکی مـــێـژوویی و ئامـــانجی جیبەجێکردنی ئەرکە سەرەکییەکانی قۆناغێکی دیاریکراو بێت)[1].

ئەوا ئەم چەمکە لەلایەن ڕژێمی عێراق نەک هەر شێوێنراوە یان گۆڕانی بەسـەردا هاتووە بەڵکو هەر وجـودیشی نـیـیـە چونکە دید و بۆچوونی ئەم ڕژێمە بۆ مـەسـەلە سـتـراتیـژی و ئەمنیـیـەکـان و شـێـواز و ڕێوشـوێن و تاکتیکەکانیش دەبێ (هەر لەم چوار چێوەیەدا سەیر بکرێ کە بەشێکە لە هێڵە گشتییەکانی ستراتیژی گشتیان و لە سەرچاوەی بیروباوەڕەکەیانەوە هەڵقـوڵاوە کـە تا ئەندازەیەکی زۆر لە چەندین ڕووەوە لە تاکـتـیـک و ڕێوشوێن و ئسلوبەکانی نازییەکان و فاشییەکان و سەهیۆنییەکان دەچێت لە جۆری ڕەفـتـارکردن لەگەڵ ژێردەستەکانیـاندا بەڵام لێرەدا بەشێوەیەکی دواکەوتووتر و دڕندانەتر).[2]

هەروەها ئەمنی سـتراتیـژی ئێـسـتـای عـێراق (لەسەر بنچینەی جیاوازی ڕەگەزایەتی و جیـاوازی حزبایەتی و جیـاوازی مـەزهەبی دانراوە، لەسـەر زەوتکردنی مـافە مرۆیی و دیموکراتییەکانی گەل دانراوە، هەروەک لەسەر بنچینەی فراوانخوازی و دەستدرێژی و پەلاماردانی گەلانی تر و نەتەوەی تر و دەوڵەتانی تری ناوچەکە داڕێژراوە، واتە ئەمنی سـتراتیـژی عـێراق لە ڕوانگەیەکی شۆڤێنستی و ڕەگەزپەرستانەی پەلاماردەرانەوە دامەزراوە کە قـەسـتی داگـیـرکـردنی خـاکی گـەلانی تر و هەڵلوەشـینی نەتەوە و کـەمـە نەتەوەکانی سنووری دەوڵەتی عێراق و گشت نیشتمانی عەرەبە).[3]

ئەوە لە کـاتێکدا پرانسیپی تاکـتـیکی سـتـراتیـژی دەبێت (تاودانەوەی گۆڕانکاری هەلومەرجە لەبار و دیاریکراوی خەباتی ڕۆژانە بێت و هێڵی تاکـتـیکی هەمـوو ڕێکخراوێک دەبێ هەمـیـشـە لە چوارچێوەی گـشـتی

---

(١) حوسێن محەممەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧٤).

(٢) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٨).

(٣) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧٧).

ستراتیژدا بخولێتەوە).[1]

ستراتیژی پرۆسەی ئەنفال لەناوبردنی بەکۆمەڵی نەتەوەی کورد و برانەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤی کورد بوو، هاوکات پرۆسەیەکی دڕندانەی ڕقی ڕژێم بوو بۆ شێواندنی سروشتی کوردستان لە ڕووی جوگرافی و دیموگرافیشەوە، (بەپێی ستراتیژییەکانی ئەنفال بەعەرەبکردنی شوێن و ناوچەکانی کوردستانیش بوو).[2]

چونکە لە ئایدۆلۆژیەتی ڕژێمی بەعس هەموو ئەو کەمە نەتەوانەی کە لە ناو خاکی عەرەبدا دەژین بیانێن و هیچ مافێکیشیان ناکەوێت، ئەوەتە ئەم بۆچوون و تێڕوانینە شۆڤێنستییە لەمەڕ کێشەی کەمە نەتەوەکان زۆر ڕوون و ئاشکرا لە نووسینەکانیان دەردەکەوێت کە دەڵێن: (کەمە نەتەوە عارەبەکان کە ناتوانرێ لە کۆمەڵی عەرەبدا بتوێنرێنەوە و بەشێوەیەکی تەواو بەعەرەب بکرێن دەخرێنە ژێر یاسای تایبەتییەوە کە ئەرک و مافەکانیان بەشێوەیەکی وا دیاری دەکا نەتوانن زیان بە بەرژەوەندییەکانی عەرەب بگەیەنن و هەر بە بێگانەش دادەنرێن، مافی دەوڵەتی عەرەبیشە کە هەر کاتێ بیەوێ ئەوانەی زیان بەبەرژەوەندییەکانی دەگەیەنن دەریان بکا و دروستکردنی قوتابخانە و دامەزراندنی ڕێکخراو و ڕۆژنامە بەزمانەکەیان و بانگەوازی نەتەوایەتیشیان لێ قەدەغە بکا).[3]

ئەم دید و بۆچوونە بەناو ستراتیژییەی ڕژێمی عێراق بەشێوەیەکی پراکتیکیانە لە ساڵی ۱۹۸۸ ئەنجامدرا و پرۆسەی بەدی ئەنفال لە ناوچە کوردنشینەکان لەبەر چاوی هەموو جیهان جێبەجێ کرا. سیاسەتی

---

(۱) حوسێن محەممەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (۷٤).
(۲) عەبدولکەریم مەحموود، چارەنووسێکی نادیار چەند دیمەنێک لە ئەنفالەکانەوە، کۆمیتەی بەرگریکردن لە مافی قوربانیانی ئەنفالەکان، ۱۹۹۳، لاپەڕە (۱).
(۳) حركة البعث العربي اهداف وغايات، لاپەڕە (۳)، لە ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان لاپەڕە (٦۹) وەرگیراوە.

ڕاگواستن و بەعەرەبکردن یەکێک بوو لەو خاڵە سەرەکییە ستراتیژییانەی کە ڕژێمی عێراق پەیڕەوی کردووە کە تیایدا ئامانجی سەرەکی ئەم (ڕاگواستنەی کوردان لە شوێنی خۆیان لەو پێناوەدا بوو ئەتەوەیەکی کە لە جێی ئەوان نیشتەجێ بکرێت و زێدی کورد داگیر بکەن و کوردی ڕاگوێزراویش بەزۆری بۆ شوێنێک ڕاگوێزرێن کە یان ناوچەیەکی تری کوردستانە بەمەبەستی کۆکردنەوە و ڕاگوێزانێکی یەکجاری یانیش بۆ ناوچەیەکی تر کە ناوچەی نەتەوەی سەردەست و داگیرکەرە و هەردوو تایبەتمەندێتی دووری و چڕی دانیشتوانی نەتەوەی سەردەستی لە خۆدا کۆکردۆتەوە بەو جۆرەی دەستەبەری تواندنەوەی کوردە ڕاگوێزراوەکان و بێ ئومێد بوونیان لە گەڕانەوە بۆ زێدی ڕەسەنی خۆیان بکات)[1]

هاوکات ئەم پرۆسەیە لەبیری ستراتیژی ڕژێمی عێراقدا (ڕوو لە کەمکردنەوەی مەترسی دیمۆگرافی کوردە بۆ ئەوەی ڕێژەی کورد لە چاو ڕێژەی عەرەبدا کەم بکاتەوە، بەجۆرێ عەرەبی عێراق ڕێژەی هەرەزۆری دانیشتوانی عێراق و کوردیش ڕێژەی هەرە کەمی دانیشتوانی عێراق پێک بهێنێ ئەمەش تەنها لە ڕێگەی گۆڕینی ڕاستییە مێژووییەکان و دەرکردن و کوشت و بڕی بەردەوام و هەمیشەیی کوردەوە دەکرێ کە بەعس هەنگاوی جدی بۆ ناوە).[2]

لەم بارەیەوە کۆمەڵێک بەڵگەنامە و دیکۆمێنت کە لەکاتی ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١ دەستیان بەسەر داگیرا دان بەو ڕاستییانە دەنێن، یەکێک لەو بەڵگەنامانە ئەو پێنج ئەوار (کاسێت)ەیە کە بەدەنگی ئەندازیاری کیمیاباران و ئەنفال (علي حسن المجيد) خۆی تۆمار کراوە کە ئەو کات سکرتێری گشتی نووسینگەی باکووری حزبی بەعس بووە، لە

---

(١) ستران عەبدوڵلا، ڕازەکانی تەعریب و ڕاگواستن، سلێمانی چاپخانەی ڕوون، لاپەڕە (٥).

(٢) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٣).

کاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەندامی نووسینگەی باکوور و پارێزگارەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ساز درابوو ئاشکرا و ڕاشکاویانە باس لە قاتو قڕ کردنی گەلی کورد و سیاسەتی شوومی ڕاگوێزان و بەعەرەبکردنی ناوچە کوردنشینەکان دەکات، ناوبراو لە یەکێک لە وتەکانیدا دەڵێت: (ئێمە خانوودەکانمان تەخت کردن و وتمان ئادەی بڕۆن خێراکەن داکێشن بەڵام ئەوانەی ئێستا جەنگاوەرن لەسەرەتاوە پێیان دەڵێین کەوا دەبێ لە کۆمەڵگاکاندا نیشتەجێ بن، پاشان پێیان ڕادەگەیەنین بڕۆن بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی بێ ئەوەی هیچ قسە و بینەوبەرەیەکیان لەگەڵدا بکەین بەڵێننامەکەیان بۆ دەخوێنمەوە و ئەوانیش دەبێ ئیمزای بکەن پاشان لە هەر کوێ بیانبینم سەریان پان دەکەمەوە ئەم جۆرە سەگانە هەر دەبێ سەریان پان بکەینەوە).[1]

دیارە سەرکردایەتی ڕژێمی عێراق بۆ لەناوبردنی کورد و خاک و نیشتمانەکەی بەپرۆگرامێکی زۆر ورد بینانە و ئەخشە و پلانی داڕێژراو کارەکەیان ئەنجامداوە و هەموو حسابێکی ورد و درشتیان بۆ کردووە، ئەوەتە عەلی حەسەن مەجید هەر لە لێدوانەکانیدا ئەم سیاسەتە قاتو قڕیە بەئاشکرا دەردەخا و دەڵێت: (هەر کاتێکیش لە ڕاگوێزان بووینەوە لە هەموو شوێنێک دەست دەکەین بە پەلاماردانیان و بەپێی ئەخشە و پلانێکی داڕێژراوی سەربازی پێگە و سەنگەرەکانیشیان دەکوتین، لەو هێرشانەدا سێ یەک یان نیوەی ئەو شوێنانە دەگرینەوە کە لەژێر دەسەڵاتیاندایە، ئەگەر توانیمان دوو لەسەر سێی شوێنەکانیان لێ بگرینەوە ئەوە لە کەلێن و قوژبنی بچووک بچووکدا دەوریان دەدەین و ئەوجا بەچەکی کیمیایی لێیان دەدەین).[2]

بێگومان ئەو جۆرە هێرش و لێدانە کوشندە بەبەرنامەیە پێویستی

---

(١) MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٧٠).
(٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٦٩).

بەهێرشێکی سەربازی گەورە و تۆکمە هەبوو، ئەوەش جۆرە ستراتیژییەکی سەربازی ڕژێمی عێراقی گەرەک بووە. کە گەورە سەرکردە سەربازییەکان دایانڕشتووە و کاریان بۆ کردووە. (هێرش و پەلامارەکانی ئەنفال لەلایەن هێزە نیزامییەکانی هەردوو فەیلەقی یەک و پێنجەوە ئەنجام دران، بەپاڵپشتی یەکەی فەیلەقەکانی تر کە لە بەرەی شەڕی ئێراندا نەبوون، گاردی کۆماری (الحرس الجمهوري) بەشداری قۆناغی یەکەمی ئەنفالی کرد، ئەو یەکانەی تریش کە بەشداریان لەو ئۆپەراسیۆنە کرد هێزی تایبەت (القوات الخاصة) و هێزی کۆماندۆ (المغاوير) و هێزی کتوپڕی (قوات الطواريء) کە دستە و تاقمی ژێر ڕکێفی حزبی بەعس بوون لەمەڕ کاری دژە تیرۆرزمی نێو شارەکان پاشانیش چالاکییەکی پشتگیری بەرفراوان و پێشی یەکە سەربازییەکان کەوتن بۆ نێو گوندنشینە هەڵاتووەکان و ڕێکخستنی کاری بەدەستەوەدانیان گشت ئەمانە لەلایەن کوردی شێوە سەربازی جاشەوە ئەنجام دەدران)[1] هەر کاتێکیش ئەو هێزانە دەچوونە ناوچە دێهاتیەکانەوە پێشەکی (دێهاتەکانیان دسوتاند و بەبلدۆزەر تەختیان دەکرد یان دەیانتەقاندەوە ئینجا گوندە وێرانکراوەکان بەکۆێتەر دەپشکێنران بۆ کوشتنی هەر کەس و ئاژەڵێک کە تیایدا ببینرێت، هێزی پیادەش لەگەل وێرانکردنەکەدا بیر و سەرچاوەکانیان کۆنکرێت ڕێژ دەکرد، تەلی کارەبایان لێ دەکردەوە، ئینجا ئیستیخبارات بەکۆپتەر شوێنەواری وێرانکردنەکانیان دەپشکنی ئەگەر هەر بیانییەکیان ببینایە ئەوا فەرمان دەکرا بەو بەشە عەسکەرییە بۆ تەواوکردنی کارەکەی ئەگینا بەر موحاسەبە و سزا دەکەوت).[2]

ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕوانینە هەموو ئەو تاوانانەی کە ڕژێم دەرهەق بەگەلی کورد ئەنجامی داون لە ئەنفال و کیمیاباران و ڕاگواستن و کوشتنی بەکۆمەڵ و ئیعدام کردن و بێ سەروشوێنکردنی هاوڵاتیان، دەسەڵاتدارانی

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٢٨-١٢٩).

(٢) مەحموود مەلا عززەت، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧٧).

ڕژێمی عێراق ڕاستەوخۆ و بەشێوەیەکی ڕەسمی دانیان پیاناوە تەنانەت (ئەو بەڵگەنامانەی تیایاندا ڕژێم بەڕەسمی و لە ڕێگای ڕۆژنامەکانی خۆیەوە دانی بەهێرشەکانی ئەنفال ناوە، ئەوەندە زۆرە لەوە زیاترە کە لێرەدا بەغوونە هێنراوەتەوە، لە ماوەی نێوان مانگی شوبات تا ئەیلولی ۱۹۸۸ ڕژێم لە چەندین بۆنەدا لە ڕێگای ڕۆژنامەکانیەوە هەروەها لە ڕێگای ئێزگە و تەلەفزیۆنەکانیەوە باسی لە هێرشەکانی ئەنفال و ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستی هێناون کردووە، تەنانەت لەو کاتەوە هەموو ساڵێک لە ۱۷-۱۸ی مانگی ئازاردا یادی ئاشکرای ئەو هێرش و سەرکەوتنانەی کردۆتەوە).[1]

هەر ئەوەندش نا بەڵکو سەرکردەکانی ڕژێم زمانحاڵی خۆیان دانیان بەو تاوانانە ناوە و نکۆڵیان لێ نەکردووە ئەوەتە (علي حسن المجيد) لە یەکێک لە دانیشتنەکانی گفتوگۆی نێوان حکومەت و شاندی کوردی لە بەهاری ۱۹۹۱ بەڕاشکاوی ژمارەی قوربانیانی ئەنفال بەبێ هیچ پێچ و پەنایەک ڕادەگەیەنێ، (كنعان مكية) لە کتێبەکەیدا (القسوة والصمت) لەسەر زاری دکتۆر مەحموود عوسمان کە یەکێک بووە لە ئەندامانی شاندی نێردراو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا بۆمان دەگێڕێتەوە و دەبێژێت: (لەم گفتوگۆیەدا نوێنەری کوردان باسی بێ سەروشوێنەکانی لەگەڵ حکومەت کرد کە علی حسن المجيد ئامادەی ئەم کۆبوونەوەیە بوو، ئەلمەجید زۆر تووڕە بوو ڕقی هەڵسا و دۆسیەکەی بەردەمی بەتوندی داخست و هاواری کرد، ئەو زێدەڕۆییە لە ژمارەی ئەنفالکراوەکان چییە کە ئێوە دەڵێن (۱۸۲) سەد و هەشتا و دوو هەزارە، باش بزانن ژمارەکە لە (۱۰۰) هەزار تێپەر ناکات)[2] ئەم بەڵگەنامانەی دوابەشی ئەم لێکۆڵینەوەش کە بۆ یەکەمین

(۲) زیاد عەبدولڕەحمان، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (۱٤).

(۱) كنعان مكية، القسوة والصمت، الحرب والطغيان والانتفاضة في العالم العربي، منشورات هيئة الارسال العراقية المؤتمر الوطني الموحد، اربيل، ۱۹۹٦، لاپەڕە (۱۷۳-۱۷٤).

جاره بلاو دەكرێنەوە دێنە تەک چەندین بەڵگەنامەی تر کە تاوانەکانی ئەنفال ئاشكرا دەكەن و ئەنجامدەرانیشی زەلیل و ڕیسوا دەكەن، لەم ڕوانگەیەوە دەكرێ ستراتیژیەتی ڕژێمی عێراق لە ئەنجامدانی تاوانی ئەنفال دژی نەتەوەی كورد لەم خاڵە سەرەكییانەی خوارەوە كورت بكرێنەوە:

**یەكەم:** لەناوبردنی بەكۆمەڵی نەتەوەی كورد و برانەوەی ڕەچەڵەكی مرۆڤی كوردبوو چونكە (ڕژێمی بەعس هەردەم نەتەوەی كوردی بەخەتەر و مەترسی بۆ سەر نەتەوە و خاكی عەرەب داناوە و ئەندامەكانی خۆی لێ وریا كردۆتەوە كە هەوڵی تواندنەوە یاخود دەركردن یا لەناوبردنی بدەن).[1]

بەڵام ئەوە وەنەبێ كە مێژووی پرۆسەی قڕكردنی كوردان (Genocide) و پاكتاوكردنی نەژادی (Ethnic Cleaning) شتێكی تازە بێت كە بەسەر كورددا هاتبێ بەڵكو (مێژووی لەناوبردن و قڕكردنی نەتەوەی كورد دێرینە و هەر لە ڕۆژگاری میدییەكانەوە و چەندین سەدە پێش زایین بگرە تا ئەمڕۆ لەلایەن دوژمنانیەوە هەوڵی قڕكردنی و تواندنەوەیان بەردەوامە).[2]

**دووەم:** لەناوبردنی شۆڕشی سیاسی و چەكداری كورد، گەلی كورد بۆ دەستەبەركردنی مافە ڕەواكانی هەردەم لە شۆڕش و بەرخۆداندا بووە و لەم ڕێگایەشدا بەدەریا خوێنی ڕشتووە دوژمنانیش هەردەم مژوڵی سەركوتكردن و لەناوبردنی ئەم شۆڕشانەدا بوونە و بەرنامە و پرۆژەی ستراتیژیانەی تایبەتیشیان بۆ داڕشتووە، تەنانەت شۆڕشەكانیان بەمەبەستی جوداخوازی (الانفصال) ناوزەد كردووە و بە(ئەوانەی بەشداریان لە كاری توندڕەوی باكووردا كردووە)[3] تۆمەتباریان كردووین، یان سیفاتی تێكدەر و بەكرێگیراویان خستۆتە پاڵمان (هەڵبەتە مەبەستی

(١) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٠).

(٢) هەژاری عەزیز سورمێ، كورد و جینۆساید و ئیبادەكردن، هەڵوێستی یاسایی نێودەوڵەتی، دهۆک، چاپخانەی خەبات، ١٩٩٨، لاپەڕە (٢٨).

(٣) حوسێن محەمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٤).

ڕژێم لەم پرۆسەیەدا بۆ لەبەریەک هەڵوەشانەوەی ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە و تەشکیلەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و بڕینی پەیوەندی نێوان هێزەکان بەدەست ڕاگەیەشتنی بەسەر تەواوی ناوچەکاندا و دوور خستنەوەی هێزی پێشمەرگە لە قووڵایی کوردستانەوە بۆ سنوورەکان و دەرەوەی سنوورەکان و بچووک کردنەوەی گۆڕەپانی چالاکی و پەلامار و لێدە و برۆ و پارتیزانی و... تاد بووە، کە ئەمەش بۆخۆی بۆ سەرەتایەکی تر بۆ ڕێی هەندەران گرتنەبەری دەیان و سەدان کادیر و پێشمەرگە لەلایەک و لەلایەکی دیکەشەوە تێکدان و شێواندنی باری دەروونی زۆرێک لە پێشمەرگە و چاندنی تۆوی دوودڵی و بێ هیوایی لە ناخیاندا بەرامبەر بەشۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کورد).[1]

**سێیەم:** هەڵتەکاندنی ژێرخانی ئابووری کوردستان و ئیفلیجکردنی. پرۆسەی بەدی ئەنفال لێدانێکی کوشندە و ئامانجێکی سەرەکی ڕژێم بوو بۆ لاواز کردن و ئیفلیجکردنی ئابووری کوردستان، چونکە ئەم پرۆسەیە بەتەنیا سڕینەوەی مرۆڤی کورد نەبوو (بگرە ئەو شاڵاوە پەلەوەر و مەڕومالآت و ولاخی بەرزە و زۆر باڵدار و گیانلەبەری تری گرتەوە کە لەگەڵ لەناوچوونی گوندەکان و ناوەدانیدا ئەوانیش لەناوچوون کە وا مەزندە دەکرێت خۆی لە ٥ ملیۆن سەر ئاژەڵ و مەڕومالآت بدات)[2] (ئەمە جگە لە ئۆتۆمۆبێل و مەکینە و ئامێرەکانی وەرزێری و ئاش و حەوزی ماسی کە بەڕێژەیەکی زۆر لەناوچوون، ئەوەش لەبیر نەچێ جگە لە ڕەز و باخ و زەوی کشتوکاڵی چەمێکی زۆری داری چنار و بی و داری خانووبەرە لەو هەڵمەتەدا وشک بوون و لەناوچوون و سووتان).[3] ئەوە وێڕای

(١) لەتیف فاتیح فەرەج، پرۆسەی سڕینەوە، گۆڤاری ئەنفال، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٣٥).

(٢) هەمان سەرچاوە لاپەرە (٣٩)، هەروەها بڕوانە ئەنفالی خاڵخاڵان، مەلا شاخی، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠١.

(٣) لەتیف فاتیح فەرەج، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٠).

گیروگرفتی بێکاری سەدان هەزار خەڵک کە ئاسەوارێکی نێگەتیڤانەی لەسەر ڕوخساری کۆمەڵگەی کوردەواری بەگشتی نواند.

**چوارەم:** شێواندنی سروشتی کوردستان لە ڕووی جوگرافی و دیمۆگرافیەوە.

ڕژێمی عێراق لەمێژە هەوڵدەدات دیمۆگرافیای دانیشتوانی کوردستان و ژمارەی کورد لە عێراق بگۆڕێت، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین ڕێگای گرتۆتە بەر، (جارێک بەهاندانی ڕۆڵەکانی کورد بۆ گۆڕینی ناسنامەی شارستانی لە شارە کوردییەکانەوە بۆ شارەکانی دیکەی عێراق، جارێکی تریش بەگواستنەوەی خەڵکی گوندەکانی سەر سنوورەکان و ناوچە نەوتاوییەکان بۆ ناو ئۆردوگاکان بەبیانووی پاراستنی سنوورەکان و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەم گوندنشینانە).[1]

**پێنجەم:** سەرخستنی سیاسەتی بەعەرەبکردنی ناوچەکانی کوردستان.

(مەبەستی ڕژێم لە شاڵاوی ئەنفال، بەعەرەبکردنی ناوچەکانی کوردستان بوو بەتایبەتی شاری کەرکووک بەهۆی نەوتێکی زۆر لەژێر خاکەکەی)[2] بۆ ئەم مەبەستەش ڕژێمی بەعس جیا لە ڕژێمەکانی تری عێراق (بەشێوەیەکی جدی تر و قووڵتر و وردبینانەتر بەڵام شۆڤێنانە بۆ ئەم مەسەلەیە چووە و هەوڵی ئەوەشی داوە، کە بەتەواوی کورد لە ناوچە نەوتاوییەکانی کوردستان ڕاگوێزێ و دووریان بخاتەوە بەنیازی ئەوەی مەترسی کورد لەسەر پاشەڕۆژی عێراق کەم بکاتەوە یا نەهێڵێ.[3]

**شەشەم:** نانەوەی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و دەروونی لە نێوان دانیشتوانی کوردستاندا و پەیڕەوکردنی هەوڵدان بۆ مانەوە و درێژخایەنی ئەم گیروگرفتانە و نەهێشتنی دابونەریتی ڕەسەنی کوردەواری.

**حەوتەم:** نانەوەی تۆوی دووبەرەکی و ئاژاوە لە نێوان هۆز و عەشیرەتەکانی

---

(١) دکتۆر ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٣).

(٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٣).

(٣) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧٨).

کوردستان سیاسەتی (ناوچەگەرایەتی) بەتایبەتی لە نێوان دەڤەری سۆران و بادینان، هەروەها هەوڵدان بۆ گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی گەلی کورد هەروەک هەوڵی ئەوەی دەدا ئێزدی و شەبەک لە نەتەوەی کورد دابڕێ.

# بەشی چوارەم

## قۆناغەکانی شاڵاوی ئەنفال (جینۆساید)

دوای ئەوەی ڕژێمی عێراق بەشێوەیەکی پراکتیکیانە سیاسەتی (خاک سووتاندن)ی لە کوردستان پەیڕەو کرد و زیاتر لە (٦٠) شوێنی لە شار و شارۆچکە و دێهاتەکانی کوردستانی کیمیاباران کرد بەمەش تارادەیەکی زۆر توانی جڵەوی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستاندا ڕابکێشێ، ئەمجارەیان قۆناغێکی دیکەی لەناوبردنی نەتەوەی کوردی گرتەبەر کە بەڵگەنامە و دیکۆمێنتەکان[*] ئەوە دەردەخەن کە پێشتر لەلایەن سەرکردایەتی ڕژێم و گەورە بەرپرسان و تەنانەت خودی سەرۆکی عێراق سەدام حوسێن بەرنامەی بۆ داڕێژرابێ، ئەویش ئۆپەراسیۆنی ئەنفال (جینۆساید)ە کە بەپرۆسەیەکی نەخشە بۆ کێشراو زیاتر لە (١٨٢) هەزار مرۆڤی کورد بێ سەروشوێن کران تاوەکو ئێستاش نازانرێت چارەنووسیان چییە؟

هەرچەندە ئەم ژمارەیە واتە (١٨٢) هەزار کەس زۆر گفتوگۆ و تاوتوێی لەسەر کراوە کە ئایا ئەم ژمارەیە تا چەند ڕاستە وەلێ بەپێی لێدوانێکی ئەزار خەزرەجی[**] کە بەم دواییە داویەتی، ئاشکرا بوو کە ژمارەی قوربانیانی ئەنفال دوو ئەوەندەن کە لە قۆناغە یەک لەدوایەکەکانی ئەم

(*) دوای ڕاپەڕینی گەلی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١و ئازادکردنی شارۆچکەکان گەلێک بەڵگەنامە و دیکۆمێنت کەوتە بەردەست هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەم بەڵگەنامانە لە ساڵی ١٩٩٢ تەسلیم بەڕێکخراوی چاودێری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کران کە بریتی بوو لە (١٤) چواردە تەن و خرابوونە (٨٤٧) سندوقەوە و ژمارەی لاپەڕەکانی زیاتر لە (٤) ملیۆن ڕەتی دەدا دواتر گوازرانەوە بۆ نیویۆرک و ئێستا لە ئەرشیفی نیشتمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

(**) ئەزار خەزرەجی: سەرکردەیەکی سوپای عێراقی بوو، پلەی سەربازییەکەی

نۆیەراسیۆنە بێ سەروشوێن کران، بەڵام هەرچۆنێک بێت بەپێی چەند سەرچاوەیەک (لە ئەنفالدا لانی کەم ٥٠٠٠٠ هەزار یان ١٠٠٠٠٠ هەزار کەس کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون کوژراین و لەناو چووبن)[١] بێگومان لەوانەیە ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر کەم بێت کە لەگەڵ قەبارەی ئەو کارەساتەی ڕژێمی عێراق بەسەر کوردستانی هێنابێ یەکدی نەگرنەوە. شالاوی چوپری سەربازیی ڕژێمی عێراق و نۆیەراسیۆنی ئەنفال شەش شالاوی چوپری سەربازی جیا جیای لە خۆوە گرت کە لە نێوان شوبات و ئەیلولی ١٩٨٨ ئەنجامدران، وا پێدەچێت کە بەر لەدەستپێکردنی ئەم شالاوانە ژێم ئامادەباشی خۆی زۆر بەچاکی وەرگرتبێت ئەوەتە (پێش دەستپێکردنی هێرشەکە هەندێک لە ئەندامانی سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراق لەگەڵ هەردوو سەرکردەی فەیلەقی یەک و پێنج و فیرقەکانیان سەردانێکی سوسەیی (استطلاع)یان بۆ ناوچەکە کرد بۆ داڕشتنی دوا نەخشەی هێرشەکە، هەر لە هەمان کاتدا واتە لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەم و سەرەتای شوباتی ١٩٨٨ هێزێکی زۆر لە دەوروبەری ناوچەکە کۆکرایەوە بەتایبەتی لە بناری گۆیژە و جادەی سورداش و دەشتی مەرگە و کارێزە، جگە لەپڕ هێزکردنی سەربازگەکانی سەلام و سارداو و هەڵدانی سەدان خیوەت بۆ سەربازەکان، سەرەڕای ئەم هێزە بێ ژمارەش چەندین کەتیبە تۆپ و تانک و چەکی قورسی ئامادەکردبوو بۆ هێرشەکە).[٢]

---

فەریق ڕوکن بوو گەیشتۆتە سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراقی، بەپێی زۆر لە بەڵگەنامەکان لە شالاوەکانی ئەنفال بەشداری کردووە، لە دوای شەڕی کەنداوی دووەم بۆ دەرەوەی عێراق ڕای کردووە و ئێستا لە وڵاتی دانیمارکە، بەم دواییە کۆمەڵێک شکایەتی لەسەر پرۆسەی قڕکردنی کوردان (جینۆسایدی) لەسەر تۆمار کراوە و ئێستا چاوەڕێی دادگاییکردنە لە یەکێک لە دادگاکانی ئەم وڵاتە، بەپێی لێدوانەکانی ئەم دواییەی خەزرەجی ژمارەی ئەنفالکراوەکان دەگاتە (٣٠٠) هەزار کەس. بڕوانە ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژ (٤٣) ڕۆژی ٧ / ١٠/ ٢٠٠١.

(١) MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧).

(٢) د. ڕشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٨).

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ سەر کوردستان بکەین بە دوو قۆناغی سەرەکی کە هەر یەکەیان تایبەتمەندی و سیفاتی خۆی هەبووە و شێوازێکی تایبەتی بەخۆوە گرتووە.

**قۆناغی یەکەم:** شاڵاوەکانی هێرشی ڕژێم لەم قۆناغەدا پێنج مانگ و پازدە ڕۆژی خایاند کە لە ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨ دەستی پێکرد و لە ٨ی نابی هەمان ساڵ کۆتایی پێهات، ئەم قۆناغە تەنها شاڵاوی ئەنفالی کۆتایی واتە (ئەنفالی بادینان) ناگرێتەوە، چونکە ئەمەی دوایی قۆناغێکی تایبەتی هەبوو کە لە دواییدا باسی دەکەین.

## ئەنفالی یەکەم: لە ٢٣ی شوبات تا ١٩ی ئاداری ١٩٩٨[١]

هێرشەکانی ئەم شاڵاوەی ڕژێم بۆ ناوچەکانی سەرگەڵوو و بەرگەڵوو لە سێ لاوە دەستی پێکرد، سەرگەڵوو گوندێک بوو کەوا زیاتر لە شارۆچکەیەک دەچوو نزیکەی ٥٠٠ ماڵ دەبوو، ژمارەی دانیشتوانیشی خۆی لە ٣٥٠٠ کەس دەدا، دیارە گرنگی ئەم شوێنە هەروەک وا باس دەکرا بۆ هێزی پێشمەرگە لە ئاست گرنگی بەغدا بوو چونکە ماوەی چەند میلێکی کەم کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی بەنداوی بایەخداری دوکان و وێستگەی هایدرۆکارەبایی سەر بەنداو و دەریاچەکە، کەوا هەمان ناوی هەڵگرتبوو کە سەرچاوەیەکی گەورەی دابینکردنی کارەبایە بۆ شارەکانی سلێمانی و کەرکووک، جێ پەیگە و بنکە و بارەگاکانی هێزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان PUK لەو ناوچەیەدا بوو، بەڵام ئامانجی سەرەکی ڕژێم لەم هێرشانەدا بەتەنیا پێکان و داگیرکردنی بنکە و بارەگاکانی پێشمەرگە نەبوو، بەڵکو داگیرکردن و وێرانکردنی سەرجەم دێهاتەکانی ئەو دۆڵەش بوو کەوا نزیکەی ٢٥ تا ٣٠ گوند دەبوون، بەپێی سەرچاوەکان لە نێوان ٢٠٠-٢٥٠ کەس لەو گەمارۆدانەدا کوژران. لە سەرەتای مانگی ئاداردا

(١) بۆ زانینی تەواوی ئەم شاڵاوە بڕوانە MEW سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٨٩-٢٠٢).

ئەم گوندانە یەک لە دوای یەک داگیرکران و تانک و زرێپۆش هێڵەکانی بەرگری تێکشکاند و دواتریش لەلایەن دەستەکانی ئەندازیاری سوپا بە بلدۆزەر گوندەکانیان تەختی زەوی کرد، هەروەها دۆڵی جافایەتی و گوندی یاخسەمەر لەلایەن سوپای ڕژێمەوە لە سێ لاوە ئابلۆقە درابوو تەنها ڕێگایەکی هەڵاتنی لەلای ڕۆژهەڵات و سنووری ئێرانەوە هێشتبۆوە کە پانتاییەکەی (١٢) میل دەبوو، بەڵام حاڵەتێک لەم شاڵاوە بەدیاردەکەوێت ئەویش ئەوەیە کە هێزەکانی ڕژێم زۆر بەجدی هەوڵیان ئەداوە بۆ گرتنی تەواوی ئەو خەڵکەی کە بەرەو سنووری ئێران هەڵدەهاتن، دیارە ئەو حاڵەتەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا لەو دەمەدا پرۆسەی بێ سەروشوێنکردنی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستان ئەبووبوە ڕێبازی سیاسەتی ڕاستەوخۆی ڕژێم، سەرپەرشتیاری سەرەکی و سەرکردەی ئەو سوپایەی کە لە ئەنفالی یەکەم بەشداری کرد لیوا ڕوکن (سوڵتان هاشم ئەحمەد) بوو کە شارەزاییەکی تەواوی لە ناوچەکانی کوردستاندا هەبووە چونکە کاتێک لە پلەی ملازم دابوو لە کوردستان ڕاژەی سەربازی بەجێ هێنابوو، بێگومان هێزێکی ئێجگار زۆر بەهێز کە لە چەندین لیوا و فەوجی سەربازی پێک هاتبوو لەژێر فرمانی سەرکردەی ئەم فەیلەقە دابوو کە دەیان کەتیبەی تۆپ و دەبابە و زرێپۆش و هێزی ئاسمانی پاڵپشتی بوون ئەوە وێرای دەیان فەوجی سووک و مەفرەزەی تایبەت کە لە جاشە کوردەکان پێک هاتبوو بەشداری ئەم ئۆپەراسیۆنەیان کرد.

سەرەتای دەستپێکردنی هێرشەکانی وا پێدەچێت لە کاتژمێر یەک و نیو یان دووی شەوی ٢٣ی شوبات بووبێت کەوا خەڵکی یاخسەمەر و سەرگەڵوو و بەرگەڵوو لە تاریکی و باراندا بەدەنگی ناڵە و لرمەی تۆپ و ڕاجیمە بەئاگاهاتنەوە.

لە بەرەبەیانی ٢٣ی شوباتدا هێزە زەمینییەکانی ڕژێم لە هەموو لایەکەوە پەلاماری دا، ئەو سوپایەی کەمارۆی بنکە و بارەگاکانی دابوو هێندە گەورە و قەبە بوو لە پەرژینێک دەچوو کە ئەو ناوچەیەی لە بەشەکانی تری

کوردستان دابپڕێت، هێڵی بەرە ڕێک بۆ ماوەی چل میل درێژ بووبۆوە، لە بنگردی ڕۆخی خۆرهەڵاتی دەریاچەی دووکانەوە تا سلێمانی و شارۆچکەی ماوەت و چوارتا، هێزەکانی زیاتر لەسێ هەفتە توانیان بەرگریی بکەن بەڵام دواتر سوپای ڕژێم تێکی شکاندن، هەروەها ڕژێم لە ڕێگای ئەو ڕاپۆرتە نهێنییانەی هەواڵگرییەوە (الاستخبارات) و دائیرەی ئەمنی سلێمانی و فەیلەقی یەکەوە دەردەچوون ئاگاداری ئەوەیان هەبوو کەوا کارێکی هاوبەش و هەماهەنگییەکی سەربازی لە نێوان ئەڵقە لە گوێکانی ئێران (مەبەست لە پێشمەرگە)یە و سوپای ئێراندا هەیە کە لە تارانەوە نەخشەی تایبەتی و ستراتیژی بۆ کێشراوە، بەپێی ئەو هەواڵانەی هەواڵگەری عێراقی گاردی شۆڕشگێری ئێران (الحرس الثوري الايراني) کەوا لە بنکە و پەیگەکانی کاری خۆیان ئەنجام دەدەن و ئەرکی سەرپەرشتی چاودێری جێبەجێ دەکەن و مەبەستیشیان بیرە ئەوتەکانی پارێزگای کەرکووکە، هەر بەپێی زانیارییەکانی ڕژێم، ئێران چەکی دژە ئاسمانی داوەتە پێشمەرگە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەوا هەلیکۆپتەرەکانی بکەونە بارودۆخێکی بەرگری لە خۆکردنەوە، بەوەش فڕۆکەی باڵ چەسپ (الاجنحة الثابتة) لە جۆری (سۆخۆی، میراج، میگ) خرانە کار بۆ هێرش کردنە سەر بنکە و پەیگەکانی پێشمەرگە، هەروەها جۆرە فڕۆکەیەکی تر بەکار هات کە (پیلاتۆز)ی پێ دەوترا، لە دروستکراوی سویسرا بوو، شایەنی باسە لە هەر پەلامارێکدا ١٥ تا ٢٠ فڕۆکە بەیەکەوە هێرشیان دەکرد و بنکە و بارەگاکانیان دەپێکا.

دوای هێرشە چڕوپڕەکانی ڕژێم و داگیرکردنی ئەو ناوچانە زۆربەی هێزەکانی پێشمەرگە توانیان پاشەکشە بکەن و خۆیان دەرباز بکەن یان بەرەو خوارووبگوێزنەوە و لە ناوچەی گەرمیان کۆ ببنەوە، بەڵام کە بینیان هێزەکانی ڕژێم لە هەموو لایەکەوە ڕێگایان لێ گرتوون ئەمجارە ڕێگای باکووریان گرتەبەر و بەرەو چیاکانی قەندیل لەسەر سنووری ئێران و عێراق نزیک حاجی ئۆمەران و هەندێکیشیان بۆ قەراخ دەریاچەی دۆکان هەڵاتن.

بەیانی فڕۆکە جەنگییەکانی ڕژێم بەسەر ئەوانەی دەربازبوون و ڕایانکردبوو سووڕانەوە و پەرەشووتیان خستە خوارەوە، لە کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەش شەش فڕۆکەی تر دیسان گەڕانەوە سەریان و بۆمباکانیان خستە خوارەوە، ئەم ناوچەیە خەڵکێکی زۆری لە خێزانی ڕاکردوو و پێشمەرگە لێ بوو کە زۆربەیان لەو خیوەتانەدا دەژیان کە هەڵیان دابوو، لەم هێرشە ئاسمانییەدا وا مەزندە دەکرێت کە نزیکەی (٢٨٠) کەس کوژرابن و (٣٠٠) کەسیش بریندار بووبن.

دوای ئەوەی ڕژێم بەشێوەیەکی ڕەسمی دەنگوباسی ئەنفالی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی خۆی بڵاوکردەوە و پەردەی لەسەر ئەو تاوانە دڕندانەیە لادا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەگشتی گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە مەسەلەیەکی ترسناک لە ئارادایە و هیچ شتێکی ئەوتۆیان پێ ناکرێت کە هیچی تر بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن بۆیە پێویستە هەر لە ئێستاوە چارەسەری خۆیان بکەن، ئەوەبوو لە ڕادیۆکاندا، ئەو مەترسییانە دەخرانە ڕوو کە ڕووبەڕووی هاوڵاتیان دەبێتەوە و هەڕەشەی لەناوبردنیان دەکات، بۆیە زۆربەی خەڵک ناچار بوون ڕابکەن و خۆیان لە مردن ڕزگار بکەن و هەرچی ماڵ و سامانیشە کە هەیتیان بەجێی بهێڵن، هەندێکیان بەشێوەی نهێنی ڕوویان لە شار و شارۆچکە گەورەکانی کوردستان وەک هەولێر و سلێمانی و دهۆک کرد، بەڵام بەشی هەرەزۆریان ڕووەو سنووری عێراق - ئێران ڕایان کرد، ئەوانەش کە کەوتنە دەست هێزەکانی ڕژێم ئەوا دەسبەجێ شوونبزر کران، تەنانەت ئەوانەش کە لەسەر سنوور بوون و دواتر هێزەکانی ڕژێم گرتنیانی هەمان چارەنووسیان هەبوو، هەندێکی تریش کەوا بەبڕیاری درۆی لێخۆشبوون بڕوایان کرد و هاتنەوە عێراق دەسبەجێ شوونبزر کران.

لە هەموو ئەو هێرشانەشدا چەکی کیمیایی بەخەستی بەکار هێنرا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکە بەشتێکی ئاساییان وەرگرت، چونکە پێشتر لە چەندین شوێنی جیا جیا ئەم چەکە بەکار هێنرا

بوو. ئەنفالی یەکەم زیاتر لە (١٠٠) هێرش و پەلاماری جیا جیای لە خۆوەگرت لە ئەنجامدا ئەو گوند و ناوچانەی وێران کرد (قەمچۆغە، شاخەڕەش، دۆڵە ڕووت، قزلەر، قەرەنگوێ، مەولان، قەرەسەرد، پیربایز، دۆڵی مازەلە، قەڵەم پاشا ئاسۆس، قەرەچەتان، شەدەڵە، پیرەمەگروون، زێوێ، گەڕەدێ، دابان، شارستێن). بنکە و بارەگاکانی پێشمەرگە کە لەوێ بوون دەستیان بەسەر داگیرا، لە شەوی ١٨ / ١٩ ی ئاداری ١٩٨٨ شاڵاوی ئەنفالی یەکەم کۆتایی پێهات و لە ١٩ی ئاداری هەمان مانگدا بەیانێکی سەربازی ڕژێم ژمارەی (٢٠٨٧) لەلایەن سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان (القیادة العامة للقوات المسلحة) ڕاگەیاندرا و تیایدا باسی سەرکەوتنێکی مەزن و بێ وێنەی کردووە بەسەر (یاخیبوو و بەکرێگیراوان). دوای سێ ڕۆژ پاش ئەمەش شاڵاوی ئەنفالی دووەم دەستی پێکرد.

## ئەنفالی دووەم: هێرشەکان بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ لە ٢٢ی ئادار تا ١ی نیسانی ١٩٨٨[1]

دوای ئەوەی لە ئەنفالی یەکەم ناوچەکانی سەرگەڵوو و بەرگەڵوو و دۆڵی جافایەتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ڕژێم و بەمەش زەرەر و زیانێکی ئێجگار گەورە و کاریگەر بەناوچەکە گەیەنرا و لە ئەنجامدا بەسەدان کەس کوژران و خەڵکێکی زۆریش کە زۆربەیان ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە بوون ئاوارە بوون و دواتر هەندێکیان لە کاتی ڕاکردن و لەبەر سەرما و بەفری ئەو ناوچەیە کە هێشتا نەتوابۆوە لە ڕێگادا مردن، ڕێک دوای سێ ڕۆژ لە کۆتایی ئەنفالی یەکەم هێزەکانی ڕژێم لە ٢٢ی ئاداردا بەسوپا و هێزێکی قەبارە گەورە و ژمارە زۆرتر لە ئەنفالی پێشوو، گەمارۆی چیاکانی قۆپی قەرەداغی دا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ دامودەزگاکانی هەواڵگری

(١) بۆ زانیاری بڕوانە MEW سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢٢١-٢٤١).

عێراقی زانیارییەکی تەواویان لەسەر ئەوە هەبوو کە پاسدارانی ئێران بەوپەڕی ئارەزووی خۆیان خەریکی جموجۆڵن لە بنکە و بارەگاکانی پێشمەرگە لە قەرەداغ(*) چونکە ئەو ناوچەیە دوای چۆڵکردنی لە ساڵی ١٩٨٧دا تەنها سوپا و جاشی تیادا مابوو، بەڵام دواتر کەوتە ژێر دەستی هێزی پێشمەرگە.

گوندی سێوسێنانیش دەکەوتە قوڵی ڕۆژهەڵاتی قەرەداغەوە، بەپێی ڕاپۆرتەکانی دەزگا ئەمنی و هەواڵگرییەکانی ڕژێم هێزێکی ٢٠٠ کەس گاردی شۆڕشگێڕی ئێرانی لەم ناوچەیە بوونە و لە مانگی ئاداردا ژمارەیان گەیشتۆتە ٤٠٠ کەس، لە مانگی شوباتدا هەشت فڕۆکەی عێراقی هێرشێکی کیمیاییان کردە سەر تەکێ و بەڵەگجار، یەکێک لەو شایەت عەیانانەی کە بەچاوی خۆی بۆردومانەکەی بینیوە دەگێڕێتەوە کە، فڕۆکەکان بۆمبێکی زۆریان بەردایەوە نازانم چەند بوو، ڕەنگە هەشت یان نۆ بووبێت کاتێ کە دەتەقینەوە ناڵەیەکی زلیان دەهات بەڵام دوکەڵێکی کەمیان هەبوو، ئەو کەسانەی دەستیان پێی کەوتبوو دواجار پێستیان تلۆقی کردبوو، ئەو ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتەش کە لەو گژوگیایەیان خواردبوو کە بەر کیمیاییەکە کەوتبوون یەکسەر مردار بووبوونەوە، بەڵام هیچ زیانێکی گیانی لە خەڵکەکە نەکەوتبوو، چونکە خۆیان لە کونە تەیارەکان حەشار دابوو، پاسدارەکانیش سێ چوار ڕۆژ پێش ئەنفالی قەرەداغ لە بەڵەگجار دەرچووبوون، هێزەکانی پێشمەرگە لە ترسی چەکی کیمیایی پەرت و بڵاوی ناوچەکەیان کردبوو هەر بەپێی ڕاپۆرتی دەزگای هەواڵگری و ئەمنیەکانی ڕژێم، (تاقمی خیانەتکاران نزیکەی ١٥٠٠ دەمامکی گازیان لە ڕژێمی ئێرانی وەرگرتووە)، دیارە ئەم پێشبینی و وەخۆکەوتنە

---

(*) قەرەداغ شوێنێکی ئێجگار جوان و دڵگیرە. زنجیرەیەک شاخی مشار ناسا کە نزیکەی ٧٠ میلێک بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەکشێ. لە ساڵی ١٩٨٧دا ناحیەکە چۆڵ کرا و دانیشتوانیشی بۆ هەردوو کۆمەڵگەی ئەسر و زەڕایەن ڕاگوێزران.

کەمێک کەڵکی هەبوو بۆ ئەنفالەکەی قەرەداغ لە ٢٢ی ئاداردا یەکێک لە کوشندەترین پەلاماری کیمیایی تێدا ئەنجام درا بۆ سەر گوندی سێوسێنان.

یەکێک لەو شایەت عەیانانەی کە ڕووداوەکەی بینیوە بەم شێوەیە وەسفی دەکات کە: سەر لە ئێوارەی ٢٢-٢٣ی ئادار دوای نوێژی ئێوارە لە ماڵەوە بەرامبەر گوندی سێوسێنان وەستابووم لە کاتێکا گڵپەی ئاگری بۆمبارانی چرویری گوندەکەم دیت، ئەم بۆردومانە لە دەربەندیخانەوە بەڕاجیمەی چلی کرایە سەر سێوسێنان، لە ئەنجامدا لە کۆی گشتی دانیشتوانی گوندەکە کە ٣٥٠ ماڵ بوو ١٥٠٠ کەسی تیادا دەژیا زیاتر لە (٨٠) کەس گیانیان لە دەست دا. (لە بڵاوکراوەیەکی بەشی ڕاگەیاندنی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان KDP ناوی ٦٦ کەسی کوژراوی تەمەن ١ تا ٥٩ ساڵ هاتووە کە خەڵکی گوندەکانی ناوچەی قەرەداغن و لە شەوی ٢٨ / ٢٩ی ئادار بەر هێرشی کیمیاباران کەوتوون ئەم ژمارەیە بەشێکە لەو ژن و منداڵ و پیر و گەنجە بەرکەوتووەی ناوچەکە).[١]

قەرەداغ لە هەموو لایەکەوە بەسوپا ئابلۆقە درابوو بۆیە خەڵکی ناوچەکە بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان ڕوویان کردە شاخی زەردەوە و خۆیان و منداڵیان بەرەو سلێمانی ڕۆیشتن و ماڵ و سامانیشیان جێهێشت و تاڵان کرا، ژمارەیەکیشیان لە ڕێگا گیران و ئەنفالکران، بەشی دووەمی خەڵکەکە بەناو قوڵیی قەرەداغدا بەرەو ناوچەکانی سەنگاو و گەرمیان پاش ناخۆشی و ماندووبوونێکی زۆر پەڕینەوە و دەرباز بوون، هێرشەکان لە قۆڵەکانی چەمچەماڵ، کەرکووک، دوزخورماتو، کفری، کەلار، باوەنوور، دەربەندیخان، شارەزوور، تانجەرۆ، بەکرەجۆ و بازیان دەستی پێکرد. لە

(١) قسم الاعلام في المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكوردستاني العراق. من جرائم القتل العام في كوردستان عام ١٩٨٨، شباط ١٩٨٩، مطبعة خبات ص (١٠-١٢).

ئەنجامدا ڕژێم ئەو خەڵکەی خڕ کردەوە کە گیرابوون، ئەفسەرانی سوپا وایان لە خەڵکەکە گەیاندبوو کە بۆ ئۆردوگایان دەبەن بەڵام کاتێ خەڵکەکە سواری زیلی سەربازی و ئۆتۆمبێلە زەوتکراوەکانی خەڵکەکە کران و بەپیر و منداڵ و ژن و زەلامەوە بەرەو قەڵا و ئۆردوگای سەربازی تۆپزاوەی نزیک کەرکووک ڕاپێچ کران.

پاش کیمیابارانکردنی گوندی سێوسێنان و تەکیە لە هەمان شەو کاتژمێر (١٢)، گوندی (دوکان) کیمیاباران کرا، لە ڕۆژانی ٢١ تا ٢٧ی ئادار بەبەردەوامی ناوچەی قەرەداغ بەکیمیایی بۆردومان کرا، هاوڵاتییەکی گوندی سەنگاوی دەڵێت: (ئێمەیان برد بۆ ئەمنی سلێمانی و سێ هەفتە لەوێ ئازار و ئەشکەنجەیان داین، هەر ئەوەی چەند کەسێکیان بانگ دەکرد و ئیفادەیان وەردەگرتن گوایە تێکدەر و ئێرانین و بەچەکەوە لەشەڕ گیراون، سەرۆک تیرەیەکی عەشرەتی جاف بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی لەم ئەنفالەدا دەگێڕێتەوە: (کاتێ گیراین ئەفسەرێکی سوپا پێی گوتین دەتانبەین بۆ کۆمەڵگا تاکو ژیانتان خۆش بێت و خزمەتگوزاری شارستانیتان بۆ دابین بکرێت، بەڵام دوایی درۆ دەرچوو بۆ سەربازگەی قۆرەتوویان بردین، نزیکەی (٨) هەشت هەزار کەس دەبووین لە ژن و منداڵ و پیر و گەنج، پاشان بۆ تۆپزاوەی نزیک کەرکووک بردراین ئینجا لەوێ گەنجەکانیان جیا کردەوە و جلیان لەبەر داکەنان و بۆ شوێنی نادیار ڕەوانە کران، بەشی دووەمی خەڵکەکەش کە ژن و منداڵ و کچە عازەبەکان بوون خرانە زیندانەوە، بەڵام بەشی سێیەم کە پیرەژن و پیرەمێردەکان بوون لەگەڵ هەندێ منداڵ بەرەو نوگرە سەلمان براین).[١]

لە گرتووخانەی نوگرە سەلمانیش بەندییەکان بەشێوەیەکی زۆر سەخت و دژوار و دوور لە هەموو بنەما و خوو و ڕەوشتێکی مرۆڤایەتی ئازار و ئەشکەنجە دراون و مامەڵەیان لەگەڵ کراوە). عەدالەت تاڵەبانی کە

---

(١) د. ڕشاد. م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٣-٢٤ .

یەکێکە لەو بەندیانەی کاتی خۆی لە نۆپەراسیۆنەکەدا گیراوە و دواتر بۆ نوگرە سەلمانیان بردووە خۆی واقیعی ناو گرتووخانەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (لە قرچەی گەرمای هاویندا کە ژمارەی بەندکراوەکان نزیکەی ۹ تا ۱۰ هەزار کەس دەبوو تەنها دوو تانکەر ئاویان بۆ دەهێنایین، هی وا هەبوو ۲٤ کاتژمێر ئاوی بەرنەدەکەوت، نزیکەی ۱۵۰ ئافرەتێکی لاو و منداڵدار کە لە کاروانی یەکەم هێنرابوون بۆ نوگرە سەلمان ئەوانەی منداڵی شیرەخۆریان بوو لە ماوەی ۷ تا ۱۰ ڕۆژ هەمووی مردن چونکە دایکەکەی هیچی نەدەخوارد تاکو شیری هەبێت و بیدات بەمنداڵەکەی).[1]

لە کاتی ئازاردانی جەستەیش ئەوا بەنوێترین شێوەی ئازاردان (تعذیب) بەندییەکانیان دەکوتا، بۆ نموونە (بوتڵە شووشەیەکی ئارەق یان بیرەیان لە نێوەڕا دەشکاند ئیتر ئەوەی دەمایەوە وەکو پەنجەی دەست تیژ بوون، بەندییەکانیان ناچار دەکرد لەسەری دابنیشن و زۆر بەتوندیش دەستیان دەنا بەسەر شانیان بۆ ئەوەی ئەو شووشە شکاوە بچێتە ناو گیانیان، ئینجا خوێن وەکو جۆگای ئاو لە لەشیاندا دەچۆڕاوە و هیچ چارسەر و دەرمانێکیش نەبوو، جاری واش هەبوو ئامێری سێکسی (جهاز التناسلي) پیاوەکانیان بەپلایز دەکوشی تا لەهۆش خۆیان دەچوون).[2]

دوای ئەوەی ڕژێم بەشێوەیەکی چڕوپڕ و بەردەوام ناوچەی قەرەداغی بۆردومان کرد، لە دوای نیوەڕۆی ۲۳ی ئاداردا هێرشی زەمینی کردەسەری و داگیری کرد، ئەوانەی کە ڕایان کرد و دەرباز بوون بوونە دوو بەش، بەشێکیان ڕێگای باکوریان گرتە بەر کە ڕێژەیەکی زۆر بوون لە خەڵکەکە و بەرەو کۆمەڵگەکانی سەر ڕێگا و شاری سلێمانی چوون کە خۆشبەختانە ڕزگاریان بوو نەکەوتنە دەستەوە، بەشەکەی تریش ڕووەو گەرمیانی خواروو ڕێگایان گرتەبەر کە چارەنووسێکی شووم چاوەڕێی کردن و زۆربەی زۆریان

---

(۱) عەدالەت تاڵەبانی، ئەنفال و نهێنییەکان، ۱۹۹۹، لاپەڕە (۵۹).

(۲) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (۱۵).

دەستگیر کران و شوێنبزر کران، بەپێی چەند زانیارییەک ژمارەی ئەوانەی لەم ناوچەیە دەستگیر کران دەگاتە (٢٠٠٠) دوو هەزار کەس و دەسبەجێ ڕەوانەی ئەمنی سلێمانی کران، سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی ڕژێم لە ٢٢ی نیسان بەیاننامەی ژمارەی (٣١٠٩)ی بلاوکردەوە کە تیایدا باسی پاککردنەوەی تەواوی ناوچەی قەرەداغ دەکات (خیانەتکاران) و تێکدانی بنکەکانیان لە (تەکیە، بەلەگجار، میولی، بانی مورد، چرچە قەلا، بەلەکان، دەربەند فەقیرە، قەرەداغ، ئۆقلا، جافەران، بوخشێن، سێوسێنان، زەردە، کلۆش، بێرکێ، کلاو جومعە، بەخشێ، دەربەند باسەرە، سەگرمە، قۆپی قەرەداغ، ئەچداخ). دوای ئەمە هەفتەیەکی نەبرد کە شالاوی ئەنفالی سێیەم دەستی پێکرد کە بەگەورەترین و ترسناکترین قۆناغ دادەنرێت لە ئۆپەراسیۆنی جینۆسایدی خەڵکی کوردستان.

## ئەنفالی سێیەم: هێرش کردنە سەر ناوچەی گەرمیان لە ٧ تا ٢٠ی نیسانی ١٩٨٨.(١)

دوا بەدوای ئەنفالی دووەم دەست بەسەرداگرتن و شوون بزرکردنی خەڵکی ناوچەی قەرەداغ، ئەمجارەیان ڕژێم هێرشێکی تری بۆ سەر ناوچەی گەرمیان ئەنجام دا، کە بەگەورەترین و کاولکاریترین شالاوی سەربازی دەژمێردرێت لە قۆناغەکانی ئۆپەراسیۆنی ئەنفالدا، تیایدا هەموو ناوچەکانی دوزخورماتو، قادرکەرەم، کفری، کەلار، چەمچەماڵ، تیلەکۆ، پێباز، سەنگاو، تەکیە، ئاغجلەر ڕاماڵدرا و وێران کرا، هەروەها زەرەر و زیانێکی یەکجار گەورەی گیانی و مادی بەدانیشتوان کە نزیکەی (٥٠٠) گوندی ئەم ناوچەیە گەیاند و زیاتر لە (٣٠) سی هەزار ژن و منداڵ و پیر و گەنجی بێ سەروشوێن کرد.

شالاو دوای شالاو بۆ سەر کوردستان گەورەتر و کاریگەرتر دەبوون بۆیە

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم هێرشانە بڕوانە (MEW)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٤١-٣٠٠).

هێزی پێشمەرگە و (هێزی پشتگیری)[*] کە دواتر لە گوندەکان پەیدا ببوون بۆ هاریکاریکردنی پێشمەرگە و شەڕکردن لەگەڵ ڕژێمدا نەیانتوانی بەرەنگاری قەبارەی ئەو هێز و سوپایە زۆرە ببنەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی زیاد لە هەفتەیەک شەپۆڵ لە دوای شەپۆڵ هێرش و پەلاماردانی پیادە و زرێپۆش و تۆپخانە و فڕۆکە و جاش ناوچەکەی گرتبۆوە هێزی پێشمەرگە هیچ پاڵپشتی و ئازووقەیەکی نەبوو و نەیدەگەیشتێ، ئەوانەش کە لە شاڵاوەکانی ئەنفالی یەکەم و دووەمەوە دەرباز بوون و خۆیان گەیاندبووە ئەو ناوچەیە گشتیان ماندوو و شەکەت بوون ورەیان بەجارێک ڕووخابوو، دیارە ئەوەش کاریگەری هێرشی کیمیابارانکردنی سەر دۆڵی جافایەتی و قەرەداغ و هەڵەبجە بوو کە باڵی بەسەریاندا کێشابوو، بۆیە خەڵکی گەرمیان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە خۆ بەدەستەوەدان دوا ڕێگایتیان کە بیگرنە بەر، هەروەها سوپا ئەو بێ هێزی و شەکەتییەی قۆزتەوە و ناوچەکەی بەجێ نەهێشت تاوەکو هەموو گیانلەبەرێکی دەستگیر نەکرد و شوێن هەموو گوندنشینێکی هەڵاتوو دەکەوتن بەهەلیکۆپتەر و بەپێ بۆ ناو شاخ و شارۆچکە و شارەکان، هەروەها هۆیەکی دیکەی دەستگیرکردنی ئەو خەڵکە زۆرە ئەوە بوو کە (پارێزگای سلێمانی بەهۆی قایمقامییەتی چەمچەماڵ و بەرێگای مستەشارەکان پروپاگندەی زۆریان کرد کە حکومەت هەر خێزانەی (٣٠٠) مەتر زەوی دەداتێ لەگەڵ قەرزی خانووبەرە (العقار)، ئەمەش وای کرد کە خەڵک هێور بێتەوە و ڕانەکەن بۆیە بەزۆری گیران).[١]

هەروەها یاداشتێکی بەرەی کوردستانی بەلیستێک قوربانییانی ئەنفالی گوندەکانی هەردوو پارێزگای کەرکووک و سلێمانی بۆ لیژنەی مافی مرۆڤی

---

(*) هێزی پشتگیری: لە خەڵکی مەدەنی پێک هاتبوو کە لە بنەڕەتدا پێشمەرگە نەبوون بەڵکو خۆیان چەکیان دەکری و دەچوونە پاڵ پێشمەرگە بۆ بەرگریکردن لە گوند و دێهاتەکانیان، هەموو گوندێک یەکەی بەرگریی مەدەنی خۆی هەبوو.

(١) د. ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣١).

نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٤ی شوباتی ١٩٨٩ تۆمار کردووە کە تەنها لە هەر دوو مانگی ئادار و نیسانی ١٩٨٨. زیانەکان بەم شێوەیە: (نزیکەی ٧٢٨ گوند و شارۆچکە وێران کراون و ٤٠ هەزار خێزان ڕاگوێزراون کە ١٦ هەزاریان لە زیندانەکانی ڕژێمدان. ٧٤٠٧ ئافرەتی ناوچەکانی زەنگەنە و جەباری و سەنگاو لە گرتووخانەی دوبز بەند کراون، ٥٦٠٠ ئافرەتی ناوچە جیا جیاکان لە ناحیەی یایچی بەند کراون و ٤٥٦٠ منداڵ لەگەڵ ئافرەتاندا گیراون کە بەدەیانیان لێ مردوون، هەروەها چەندین منداڵی تەمەن شەش مانگ تا یەک ساڵی هەریەکەی بە ٥٠ دینار فرۆشراوە و ٧٦٤٠ پیاو شوونبزر کراوە و سووکایەتی بەڕەوشت و کەرامەتی ئافرەتان کراوە کە دوور لە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤایەتییە).[١]

شاڵاوەکانی ئەنفالی سێیەم (گەرمیان) لە ناوەرۆکدا خۆی لە (٣) سێ پەلاماری جیا جیا بۆ ناوچەکانی ئەم دەڤەرە بینییەوە. یەکەم پەلامار بۆ دوزخورماتوو بوو ڕۆژی ٧ی نیسان کە یادی دامەزراندنی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکییە، هێزەکانی ڕژێم بەهەموو پێکهاتەکانی سوپا و یەکەکانی هێزی کتوپڕی و هێزەکانی تایبەت و فەوجەکانی جاش لە بنکە تایبەتییەکانی خۆیان لە دوزخورماتوو دەرچوون. دوو ڕۆژ دوای ئەوە چەند هێزێکی تر لە کەرکووک و لەیلان و چەمچەماڵ و سەنگاوەوە بەهەمان شێوە دەرچوون و لە هەموو لایەکەوە ڕووەو شارۆچکەی قادر کەرەم پێشڕەویان کرد، هێزی دەرچووی دوزخورماتوو بوو بە سێ هێزی هاوبەشەوە (Task Force) یەکەمیان بۆ باشووری ڕۆژهەلاَت لە شارۆچکەی ئەوجوولەوە بەرەو چەمی ئاوەو سپی، دووەمیان کەوا هێزێکی هاوبەشی گەورەتر بوو بەرەو ڕۆژهەلاَت پێشڕەوی کرد بەگوێ چەمدا کە پێک هاتبوو

(١) قسم الاعلام في المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكوردستاني، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧-٢٩ .

له لیوای ٦٥ی هێزی تایبەت و لەلایەن هەردوو فەوجی بەرگری نیشتمانی ٥٨ و ٢٠٠دوه پاڵپشت دەکرا، بروسکەی هەواڵگری دوزخورماتوو ژمارە ٣٤٠٥ی نیساندا سکاڵای ئەوە دەکات کەوا فەوجێکی تری جاش کە فەوجی (٢٥)ە لە هێزەکە کشاوەتەوە و ئەو ئەرکانەی کە پێی سپێردراوە ئەنجامی نەداوە. ئەو هێزە هێرشی کردۆتە سەر (١٧) گوند دوای شەڕوپێکدادانێکی زۆر لەگەڵ ئەو هێزە پێشمەرگەی کە لەوێ بووە تەواوی گوندەکانیان ڕاماڵیوە و وێرانیان کردووە زیانیشیان یانزە کوژراو بووە کە هەشتیان جاش بوون. سێیەمیان ئەو هێزە هاوبەشە بووە کە پەلاماری گوندی تازە شاری دا، کە گوندێکی ستراتیژی گرنگ بووە، بەهۆی هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیی لە نێوان دوزخورماتوو و قادر کەرەم، لە ٩ی نیساندا هێزەکانی ڕژێم گوندەکانی (کانی قادری سەروو و خواروو، ئاوایی شێخ حەمید، کەریم بەسام، عەزیز بەگ)ی وێران کرد و خەڵکەکەشی شوونبزر کرد.

ئەگەرچی باسوخواسی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە ئەنفالی سێیەمدا نییە کە ڕژێم هەر وەکو لە ئەنفالی یەکەم و دووەم بەکاری هێنا وەلێ شایەت عەیان هەن کەوا گەواهی ئەوە دەدەن و بەچاوی خۆشیان بینیویەتیان کە چەکی کیمیایی بەکارهاتووە تەنانەت لە جفرەکانی فەرماندەی سوپای ڕژێمەوە لە ڕێگای ڕادیۆوە گفتوگۆی بێتەلی نێوان فەرماندەکانی سوپاوە بیستراوە کە بۆ لەناوبردنی تێکدەران و یاخیبووان گاز تاکە ڕێگەیە بۆ تێکشکاندنی بەرگریيان.

هەروەها فڕۆکەی هۆکەرهەنتەری بەریتانی بینراوە کە گوندی تازە شاری بۆردومان کردووە و گەواڵە و دوکەڵی سپی زۆری لێ پەیدا بووە، ئافرەتێکیش کە خەڵکی گوندی شێخ حەمیدە لاشەی ٢٥ پێشمەرگەی بینیبوو کە بەگاز خنکابوون، کاتێک ژمارەیەک لە بزن و مانگا و پەلەوەری بینیوە لەوێ مردوون ئەوسا گەیشتۆتە ئەو ڕاستیەی کە گازی کیمیایی بەکار هێنراوە هەروەها ئەگەری ئەوەش هەیە کە لە ١٠ی نیسانیشدا بۆ

دووەم جار هێرشی کیمیایی ئەنجام درابێت، جوتیارێکی مەڕدار لە گوندی ئالاوی باس لەوە دەکات کە ئەو پێشمەرگانەی لەوێ دەرباز ببوون بەو لایەدا هەلاتن لە دەوروبەری نیوەشەودا فڕۆکە بۆردومانی کردن، لە ئەنجامدا دە کەسی لێ کوشتوون. پەلاماری دووەم بۆ قادرکەرەم و باکووری گەرمیان بوو، ئەو هێزانەی کە لە کەرکووک و چەمچەماڵەوە دەرچووبوون و بەرەو قادرکەرەم پێشڕەویان کردبوو لە ١٠ی نیساندا بەسەرپەرشتی عەمیدی هێزی تایبەت (بارق عبدالله الحاج حنطة).[*] کە وا پێدەچێت فەرماندەی گشتی شالاوی ئەنفالی سێیەمی پێ سپێردرابێت گەیشتنە ناوچەکە و هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکیان نەهاتە ڕێ و هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکیان لەلایەن پێشمەرگەوە بەرامبەر ئەنجام نەدرا.

لەم هێرشەدا هێزێکی جاش هەردوو گوندی چەپەک و ئیبراهیم غولامی تێک دا، ئیبراهیم غولام کە گوندێکی سەر بەعەشرەتی زەنگەنە بوو لەگەڵ هۆزی جەباری دراوسێ بوون، بوونە قوربانی سەختترین وێرانکاری و تالان و برۆی ئەنفالی سێیەم.

لە هەموو هێرشەکان جاشە کوردەکان پێش سوپای عێراقی دەکەوتن و دەچوونە گوندەکانەوە ئەگەر هەر شەڕێک بوایە لەپێشا تووشی ئەوان دەبوو خۆ ئەگەر شەڕیش نەبوایە لەو گوندە ئەوەی تیایدا بوایە تالانیان دەکرد و دەیان سووتاند و دەیان ڕووخاند.

خەڵکی ئەو گوندە زۆربەی هەرە زۆریان خۆیان حەشاردا بوو، بەڵام هەندێکیان بەناچاری خۆیان بەدەست سوپا دا و دواتر شوێنبزر کران (ئەم

(*) فەرمانده‌یەکی سەربازی دڕندە بوو، پلەی جەنەڕاڵی لە سوپادا هەبوو ئەوکاتە فەرماندەی ئەو هێزە تایبەتیانە بوو کە پاراستنی بیرە نەوتەکانی کەرکووکی پێ سپێردرا بوو، لە ئەنفالی دووەمیشدا بەشداری کردووە، لە ناوەڕاستی هەشتاکانیش کاتێک شیعەکان لە باشوور هەڵسان بەڕاپەڕین ئەو پەلاماری دان و سەرکوتی کردن، لە ساڵی ١٩٩١ بارق گوایە دەستی هەبووە لە ئەنجامدانی کودەتایەک دژی سەدام حوسێن ئیعدام کرا.

ناوچەیە شـوێنێکی سـتـراتیـژی و پڕ بایەخ و بەهایە، چونکە هێـزی پێشمەرگەی لێ بوو چالاکییەکانیان تیادا ئەنجام دەدا، هەروەها ناوچەکە نزیک شـاری کـەرکـووکی بایەخـدار بوو، بۆیە ڕژێمی عێـراق زۆر دڕندانە خەڵکی ئەو ناوچەیەی دەستگیر کرد و بێ بەزەییانەش لە گەڵیاندا ڕەفتار و مامەڵەی کرد و شوونبزری کردن، ئەویش بەبێ جیاوازی لە نێوان گەورە و بچووک پیر و منداڵ، نێر و مێ، بەپێی ئامارێک ناوچەی جەباری ٥٣٩ کەسی لێ ئەنفالکراوە.[1] موستەشارەکان هانی ئەو خەڵکەیان دەدا کەوا خۆیان بەدەست هێزەکانی سوپاوە بدەن گوایە لێبوردنی گشتی دەرچووە و حکومەت هیچیان لێناکا. تەنانەت پیاوێک ١٦ لاوی هێنا کە کوڕ و خزم و کەسی بوون و هیچیـان پێشـمەرگە نەبوون داینە دەست موستەشارێک دواتر هەموویان شوونبزر کران، ئافرەتێک بەموستەشارێکی گوتبوو دەربازم بکە لەدەست سوپا، لەوەڵامدا پێی وتبوو من هیچم بۆت پێناکرێ باشتر وایە خۆت بدەی بەدەستەوە. هەر چەندە خەڵکێکی زۆر لە هەندێک گونددا بەر لە گەیشتنی سوپا بۆ گوندەکانیان شوێنی خۆیان بەجێ هێشتبوو چونکە پێشـتر هەواڵی بەسـەرهاتی گوندەکانی تریان بیـسـتـبوو کە چۆن بووە و چییان بەسەر هاتووە، بەڵام زۆریان لە ڕێگادا کەوتنە دەست سـوپا و دواتر شوونبزر کران، بۆ نموونە خەڵکی گوندی قەیتول بەدوو هەفتە پێش ئەوەی هێـرشی ئەنفـالیـان پێ بگات ڕووە و دۆڵ و چیاکـان هەڵاتبـوون هەروەها لەسـەر چیاکـان و لە دوورەوە بینیـبوویان کـە چۆن سـەرباز دەڕژێنە ناو گوندەکەیان و جاش پێشیان کەوتوون و هەلیکۆپتەریش پاڵپشتیان دەکا. دوای ئەوەی خـەڵکەکـە بەراپرسی و تاوتێکردن لە نێـوان خـۆیاندا ڕووەو چەمچەماڵ کەوتبوونە ڕێ لە ڕێگادا هێزەکانی لیوا ڕوکن بارق عبداللە لە چەند لایەکەوە دەوردیان دابوون و گرتنیان، دوای ناو نووسین دواتر بەدوو کـاروانی ئۆتۆمـبـێلی ئیـڤـای سـەربازی ڕەوانەی دەزگـا ئەمنی و هەواڵگرییەکانی کەرکووک و سلێمانییان کردن و شوونبزر کران، هەندێک

(١) د. ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨).

خەڵکی گوندی تر لە خافڵەتیدا و لەنێو ماڵی خۆیاندا لەناکاو بەهەڵمەتی لەناکاوی سوپا دەستبەسەر کران، زۆر لەشایەت عەیان (لیوا ڕوکن بارق)یان بینیبوو کە خۆی سەرپەرشتیاری و فەرماندەیی ئەو سوپایەی دەکرد و گوندەکانیان تالان و وێران دەکرد. دەمەو بەیانییەکی زوو لە گوندی (قیرچە)ی نارامدا دوای هێرش کردنە سەری و دەستبەسەر داگرتنی پیاوەکانیان لە شوێنێکدا کۆکردۆتەوە و دەستیان لەپشتەوە کەلەپچە کردوون و ڕەوانەی چەند شوێنێکی نادیاریان کردوون، هەروەها شتومەک و مەڕ و ماڵاتی گوندەکەیان بەهەمان شێوە ئەنفال کرد.

پەلاماری سێیەم بۆ سەنگاو و باشووری گەرمیان بوو دوای هەردوو پەلامار بۆ سەر دوزخورماتوو و قادر کەرەم و باکووری گەرمیان، ڕژێم پەلامارێکی تری بەرفراوانی بۆ ناوچەی سەنگاو و باشووری گەرمیان دەستپێکرد سوپا لە هەموو ناوچەکان خەریکی هێرش و وێرانکردنی گوند و دەستگیرکردنی گوندنشینەکان بوو، ئەم شاڵاوە زۆرترین گوندی لەم ناوچەیە وێران کرد و ژمارەیەکی نێجگار زۆریش لە خەڵکی شوونبزر کران (تەنها لە ڕۆژی ١٤ی نیساندا لە هەردوو گوندی ملە سوورە و کوڵەجۆی حاجی حەمەجان لە یەک کاتدا زۆرترین ژمارە خەڵکی ناوچەکە دەستگیر کران و بەژن و منداڵ و پیر و گەنجەوە شوونبزر کران. هەر بۆیەش ئەم ڕۆژە لە هەموو ساڵێکدا کراوەتە ڕۆژی یاد کردنەوەی کارەساتی ئەنفال لە کوردستاندا).[1] ناوچەی سەنگاو کە بەتەنها ٩٣ گوندی لە خۆوە گرتبوو (٥٨)یان لەپێش شاڵاوەکاندا نزیکەی (١٨) هەژدە هەزار کەسی تیادا دەژیان کە زۆربەیان لە شاڵاوەکان تیادا چوون و شوونبزرکران، ئەو گوندانەی کە لە ناوچەی سەنگاو بەرشاڵاوەکە کەوتن ئەمانە بوون (دەرەوار، بانەموورد، پێنج ئەنگوستی، حاجی محەمەد ئاغا، پێنج ئەنگوستی شێخ مستەفا، هەنجیرە، سێگومەتان، کێڵەبەرزە، دەرزیلە،

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٩)

قەلاگە، دار بەڕوو). کە بەسەدان لە خەڵکەکانیان دەستگیرکران و بۆ چەمچەماڵ بردران، هەروەها هەندێک پێشمەرگەش کە لە پەلامارەکەی قادر کەرەم و باکووری گەرمیان بەرەو باشوور هەلاتبوون بۆ خۆ دەربازکردن دەسگیر کران و شوونبزر کران، ناوچەکانی باشووری گەرمیانیش کە هاوسنوورە لەگەڵ ناوچە بەعارەبکراوەکانی دیالەدا لە بەرەبەیانی ٩ی نیساندا بەچەند هێزێکی گەورە لە شارۆچکەی کفری و کەلار و پێباز و پونگەڵە کەوتنە ڕێ، ستراتیژییەتی سەرەکی سوپا لەم هێرشانەدا هەمان ستراتیژییەت و تاکتیکی پەلاماری باکووری گەرمیان بوو کە بریتی بوو لە پرۆسەی ئابلۆقەدانێکی گەورە و فراوان لە چەندین لاوە و لە یەک کاتدا و دەستکردن بەکۆمەڵ گرتنی خەڵکەکە و دواتر ڕووخاندن و تەختکردنی گوندەکان و تالان کردنیان، فەرماندەی هێزەکانی کفری بەسەرپەرشتی لیوایەک بووە کە ناوی سامی بووە و نازناوی نەناسراوە و سەر بەفەیلەقی یەک بووە کە فەریق ڕوکن سولتان هاشم سەرکردایەتی دەکرد.

لە ١٠ی مانگ نزیکەی (٢٠) گوندی ناوچەکە بەتەواوی تەختکران لەوانەش گوندی (چوار شاخ، عەلیانی تازە، توکن، میل قاسم، دوڕاجی، بەڵگەی گەورە، بەڵگەی بچووک، ئۆمەربل،... هتد...) هێزەکانی فەروجی پیادەی سەربازی (وحدة المشاة) ٤١٧ و ٤١٨ و فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی ١٠٠، ١٣١، ١٩٧ بەشداریان لەو هێرشانە کردووە و گوندەکانیان داگیر کرد و خەڵکەکەشیان شوونبزر کرد.

هێزی هاوبەشی دووەم کە لە کەلارەوە دەرچووبوون بەسەرپەرشتی نەقیب (عبد عواد)ی فەرماندەی یەکەی پیادەی ٤١٧ لە ١١ی نیساندا هێرشی کردە سەر گوندی دوڕاجی چەند میلێک لە خۆرئاوای گوندی ئۆمەربلەوە دوور بوو، لەوێ خەڵکەکە دەستبەجێ خۆیان دابووە دەست سوپا و ڕاکوێزرانە ئەو ئۆردوگایە تایبەتە ئامادەکراوانەی کە لە نزیک فیرقەی پیادەی ٢١ بوو.

لە ١٣ی مانگ هێزەکە گەیشتە گوندی کۆڵەجۆ، بەر لە گەیشتنی هێزەکە

خەڵکەکە کە هەندێک کەلوپەلیان لەگەڵ خۆ بردبوو بەرەو کۆمەڵگەی سمود ڕایانکردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی تەنها ڕێگای نێوان کفری و کەلار مابۆوە بەناچاری ڕوەو گوندی ملەسورە چوون لەگەڵ گەیشتنی هێزەکە بەکۆمەڵێک بلدۆزەر گوندەکەیان ڕووخاند لە ١٧ی مانگیش گوندی کونەکۆتری وێران و تاڵان کرد و خانووەکانی خاپوور کرد و ئەو خەڵکەش کە دەسگیرکرابوون شوونبزر کران.

لە ١٨ یان ١٩ی نیساندا هێزەکانی کفری و کەلار بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ لە ئەنفالی سێهەمدا ئەرکەکانی خۆیان تەواو کرد، هەرچی گوندی ناوچەکانی سەنگاو و باشووری گەرمیان هەبوو تەختکران، بۆ سوێندیش تاقە گوندێکی تیادا نەما، ئەو هێزە پێشمەرگەیەش کە بەناو بەرگری دەکرد دواتر تێکشکێنران چونکە سوپا هێزەکانی خۆی دوو ئەوەندە زیاد کرد و چەک و تەقەمەنیەکی بێ ئەندازەی خستە بەردەستیان.

ڕژێمی عێراق دوای دەستگیرکردن و ڕاگوێزانی خەڵکی ئەو ناوچانە هەڵسا بەئەنجامدانی هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن و پروپاگندەی بەربڵاو کەوا ئەوانەی دەستگیر کراون (تێکدەرە ئێرانییە گیراوەکان)ن و بۆ ئەم مەبەستەش هەڵسا بەوێنە گرتنی خەڵکە گیراوەکە و نیشاندانیان لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆن بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک و دووبارە لێدانەوەی فیلمەکە. تا ئەو کاتەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (مجلس الامن القومي) عێراقی بەنووسراوی (نهێنی و شەخسی) ژمارە ل. ش. د/ ٣٧٩ لە ٢ مایسی ١٩٨٨ بۆ وەزارەتی ناوخۆ لەگەڵ وێنەیەک بۆ لیژنەی کاروباری باکووری سەر بەئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی (مديرية الامن العامة) گلەیی و گازاندە لەوە دەکات کە نیشاندانی ئەو فلیمانە زیانبەخشە و ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی هەڵوێست وەربگرن و خۆیشاندان دژی حکومەت ساز بدەن.

## شاڵاوەکانی ئەنفالی چوارەم: هێرش بۆ سەر دۆڵی زێی بچووک لە ٣ تا ٩ی مایسی ١٩٨٨[١]

دوای ئەوەی لە ئەنفالی سێیەمدا ڕژێم توانی ناوچەی گەرمیان بەتەواوی داگیر بکات و گوند و دێهاتەکانیش سەرتاپا خاپوور و وێران بکات و نزیکەی (٣٠) هەزار کەسیشی لێ بێ سەروشوێن بکات، دوو هەفتە دوای ئەوە لە ٣ی مایسدا ڕژێم شاڵاوێکی تری دەست پێکرد بۆ سەر ناوچەکانی دۆڵی زێی بچووک کە لە چەند شارۆچکەیەکی وەک (ناحیەی ئاغجەلەر و تەقتەق و ڕێدار و هەندێک گوندی وەک (عەسکەر و گۆپتەپە و گوندەکانی دەشتی کۆیە) پێک دێت.

لە ئەنفالی چوارەمدا سوپای عێراق ورەی زۆر بەرز ببووە ئەویش دوای ئەوەی لە ١٧ و ١٨ نیساندا توانی لە هێرشێکی پێچەوانەی بەرفراواندا کەوا دەیان هەزار کەس بوونە قوربانی، نیمچە دوورگەی فاو لەژێر کۆنترۆڵی ئێران بسەنێتەوە و دواتر ئێران ناچار بکات کە بێتە سەر مێزی گفتوگۆ لەسەر ڕاگرتنی شەڕی هەشت ساڵە ڕەزامەندی دەرببڕێت.

لە ڕۆژی ٣ی مایسدا کە ڕۆژێکی بەهاری جوان و دڵگیر بوو گوندی گۆپتەپە.[*] کەوتە بەر هێرشی ئاسمانی فڕۆکەکانی ڕژێم، پێش گۆپتەپە، گوندی عەسکەر کە چەند میلێک لەو دوور بوو کەوتە بەر شاڵاوی پۆلێک لە فڕۆکەی مێک و بۆمباران کرا، لەم هێرشەی فڕۆکەکاندا هەشت تەقینەوە

(١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٠٣ تا ٣٣٦).

(*) گۆپتەپە، وشەیەکی تورکییە و مانای گردی سەوز دەگەیەنێ، گوندێکی (٣٠٠ تا ٥٠٠) ماڵی دەبوو، نیمچە شارۆچکەیەک بوو دوو مزگەوت و قوتابخانەیەک و نەخۆشخانەیەکی تێدا بوو، کارەباشی بۆ ڕاکێشرا بوو، خاکێکی بەپیتی هەبوو، چەندین کێڵگەی بەرهەمی گەنم و جۆ و توتن و لۆکە و بەرهەمی دیکەی تێدا بوو. خەڵکی ئەم گوندە بەرامبەر بەزەبر و زەنگی ڕژێم زۆر خۆڕاگر و بەتوانا بوون.

ڕووی دا و دووکـەڵی سپی چووە بەرزایی ئاسـمـانەوە، بۆنێکی خـۆشی ناعناعی لێهات، لەم کاتەدا ئەو بایەی کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە هەڵی کردبوو، بەرەو گوندی (حەیدەر بەگ) ڕایماڵی کە چەند میلێک لەوێ دوور بوو بووە هۆی کوشتنی (٩) کەس، هەر ئەو دەمەش ئەو پێشـمەرگانەی کە لەوێ بوون دەسـتـیان کرد بەلێدانی دەرزی ئەترۆپین لەو کەسانەی کە بەر گـازەکـە کـەوتوون، بەکـارهێنانی ئەم چەکی کـیـمـیـایـیـە سـەرەتای دەستپێکردنی ئەنفالی چوار بوو.

کاتژمێر (٥.٤٥) دەقیقەی ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەلایەن شەش فڕۆکەی عێراقییەوە گوندی گۆپتەپەش کەوتە بەر هێرشی کیمیایی، ئەوانەی ئەو بۆردومانەیان بینیـبـوو وێنەی بۆردومـانەکە بەوە دیاری دەکەن، کە دوای تەقانەوەی بۆمبەکان دەنگەکانیان ئەوها زل نەبووە و بۆنی سـیریش هاتووە، هێـزەکانی پێشـمەرگـە ئامۆژگـاری خەڵکەکەیان کردبوو کـە لە کـاتی کـیـمـیـابارانداا ڕووەو ڕووبارەکـە هەڵێن و دەم و چاوی خـۆیان بەپەڕۆ تەڕبکەن کە ئەوەش خۆشبەختانە بووە هۆی دەرباز بوونی کۆمەڵێک خەڵک لەو کارەساتەدا.

بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا نزیکەی (٣٠٠) لاشـە لە قـوربانیـانی چەکی کیمیایی نێژراوە هەروەها لەبەر ئەوەی بۆمبێک کەوتبووە ناو ڕووبارەکە. ببووە هۆی ئەوەی کە چەند لاشەیەک لە ڕووبارەکە بدۆزرێتەوە ئەوە وێڕای پڕ بوونی زێیەکە لە ماسی مردار بوو. زۆربەی ئەو خەڵکەش کە هەڵاتبوون گەیشتنە چارەنووسێکی مەرگەساتییەوە، بەتەنها ٥٠ خێزان لە خەڵکی عەسکەر لە بەیانی ٤ی مایسدا لەلایەن هێزەکانی ڕژێمەوە لەسەر جادەی سـەرەکی گیران و بەرەو ڕۆژهەڵات گوێزرانەوە بۆ کۆمەڵگەی سوسێ، دوای کـیـمـیابارانکردنی گوندەکـان و وێرانکردنیـان، بەشـێـوەیەکی لەناکـاو و کتوپڕدا ئاوی زێ خێرا زیادی کرد، دیارە ئەوەش یەکێک بوو لە فرتو فێڵە هەرە زۆرەکـانی ڕژێم بۆ ئەوەی بەسـەر کـورددا زاڵ بێت، ڕژێم لەم کـاتەدا دەرگـاکـانی بەنداوی دوکـانی کـردبۆوە ئەویش بۆ ڕێگەگـرتن لە هەر

هەوڵدانێک بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکە بەنیازی هەڵاتن و دەرباز بوون.

دوای هێرشی زەمینی سوپا بۆ گوندەکان و کاولکردنیان، ئەو لاشانەی کە بەهۆی گازبارانەکەدا مابوونەوە و خەڵکەکە بەهۆی ڕاکردنیان نەیانتوانیبوو بیانشارنەوە، لە گۆڕی بەکۆمەڵ کە بەشۆفەڵ لەلایەن سوپاوە بۆیان لێدرا نێژران.

دوای ئەوەی خەڵکی ئەو ناوچانە گوندەکانیان وێرانکرا، ڕوویان کردە ئەشکەوت و دەشت و لێرەوارەکان، ئەویش بەمەبەستی خۆ حەشاردان و ڕزگار بوون لە توونی مەرگ و بەرداشی کارەساتی بەڵام ڕژێم بەشوێنیاندا چوو گەلێک ئاواتی دڕندانەی دژیان ئەنجام دا کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا مەحاڵە تاوانی وا ڕووی دابێ. «لەوانەش سووتاندنی دوو پیرەمێردی تەمەن ٧٠ ساڵەی گوندی موخەڕەس کە ١٠ میل لە ڕۆژهەڵاتی تەقتەقدایە دوای کوشتنیان لە ئەشکەوتی (بزن)ی شاخی گۆڕ ڕەحمان».[١]

لەم ئەنفالەدا لای کەم ١٢ دوازدە هێزی یەکەی سوپای جیا جیا لە چەند لایەکەوە هێرشیان بردەتە سەر ناوچەکان و لەیەک کاتیشدا، دوای ئەوەی ڕژێم هەردوو گوندی گۆپتەپە و عەسکەری وێرانکرد، هەندێک لە هێزەکانی سوپا لە کۆیەوە بەرەو گوندەکانی لێواری باکووری زێی بچووک ڕۆیشتن، بەشێکی دیکە کە لە باشوورەوە مۆڵی خواردبوو لە سوسێ و چەمچەماڵەوە پێشڕەویان کرد و دوو هێزیش لە تەقتەوە دەرچوون، یەکێکیان بۆ باکوور ڕووەو کۆیە ئەوی دیکەش لە زێ پەڕیبەوە بۆ ناوچەی شێخ بزێنی (بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی فەرماندەی فەیلەقی یەک تەنها لە چیای تەکەلتوو بەرگرییەکی توندی سوپا کراوە ئەگەر نا لە زۆربەی جێگاکانی تر بەرگری زۆر لاواز هەبووە، هەروەها لە سوسێ لە چەمی ڕێزان لە گوندەکان بەرهەڵستی سوپا کراوە وەک گوندەکانی سوورقاوشان و عەودالان و کەلەبەش کە پاشتر وێرانکران، گوندی تەلانیش سووتێنرا،

(١) مەلا شاخی، ئەنفالی خاڵخالان، چ١، سلێمانی، ٢٠٠١، لاپەڕە (٥٢).

دۆڵی چەمی ڕێزان لە نێـوارەی ٤ی مـایس بەتەواوی کپ کـرا و لە ٦ی مـانگ تەواوی ناوچەکە لەلایەن سوپاوە دەستی بەسەر داگیرا و زۆربەی خەڵکەکەی شوونبزر کران، دوو ڕۆژ دواتر واتە ٨ی مـانگ سوپا کۆتایی بەشالاوی چوارەم هێنا).[١]

بەدرێژایی زێی بچـووک لە هەردوو لادا بەتەواوی کـاول و وێرانکرا، ئەوانی لای باکوور کەمتر ڕێگای دەرباز بوونیان بۆ ڕەخسا و زۆر بەخرایی بەرشالاوەکە کەوتن و نزیکەی ١٦٨٠ هەزار و شەش سەد و هەشتا کەس ناونووس کراوە کە بێ سەروشوێن کراون لە گوندەکانی (کلێسـە، بۆگد، کـانی نبی، قـزڵوو، کـانی هەنجـیر، گۆمـەشێن) هەروەها سـەدانی تر لە گوندەکانی (گلناغاج، گرخەبەر، جەلۆرت، قەسرۆک، قامیشـە) هەمان چارەنووسـیـان هەبوو، بەپێی ڕاپۆرتی دسنووس ژمـارە (٨٢٨٠)ی ٦ی مـایسی ١٩٨٨ لە فـەرمـاندەی فـەیلەقی یەکەوە بۆ عـەمـەلیـاتی سـوپا زانیـاری ئەوەی تیـادایە کـە خـەڵکەکـە چەندیان ئافـرەت و منداڵ بوون، بێجگە لە سی و حەوت تێکدەر، ڕاپۆرتەکە تێبینی ئەوەی داوە کە ئەوانەی ئەو ڕۆژە لە نزیک تەقتەق خۆیان بەدەستەوە داوە ٦٠ پیاو و ١٢٩ ئافرەت و ٣٩٦ منداڵ بوون.[*] هەرچی شـــتی بەنرخـــیش هەبوایە ئەوا لە خەڵکەکەیان دەسەند، ماڵ و سـامانیشـیان بەتالان بردن و خانوەکانیشـیان گر تێبەردان، لە یەکێک لە گوندەکان لەسەر دزی و تالان و لێسەندنی پارە و زێر و خـشڵ جـاشـێک ناڕەزایی دەربڕیـبـوو، ئەفـسـەرێکی سـوپاش بەتووڕەیی پێی وتبـوو ئەو خـەڵکانە بۆ کـوشتن دەبردرێن. ناتوانن پارە و ئاڵتـونەکـانیـان لەگـەڵ خـۆیان ببـەن، چونکە یاسـای دەوڵەت دەڵێت دەبێ ئەمانە لەناوببردرێن. سەرەڕای ئەوە جاشەکە چەککرا و موستەشارەکەش پێی گوت، ئەمە قانوونی دەوڵەتی ئێمەیە و تۆ ناتوانی هیچ شتێ بکەیت.

---

(١) د. ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٥)...

(*) هەمـان ئەو زانیـاریانە لە ئەنفـالی قـەرەداغ لەلایەن فـەرمـاندەی سـوپاکـانەوە بۆ لایەنی بەرز نێردراوە، بڕوانە ئەو بەڵگەنامەی کە لە پاشکۆی ئەم کتێبە هەیە.

پاش ئەوەی سوپا بەدڕندانەترین شێوە گوندەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی تەقتەقی وێران کرد و ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکەی سەرنگوم کرد ئینجا ڕووەو دێهاتەکانی ناو شوان و ئەو (٧٦) حەفتاو شەش گوندە بۆوە کە لە مانگی (١٠)ی ساڵی ١٩٨٧ چەندینیان ڕووخێنرابوو، خەڵکەکانیشیان بۆ کۆمەڵگە زۆرەملێکانی دارەتوو و بنەسڵاوەی نزیک شاری هەولێر ڕاگوێزرابوون.

زۆر لە گوندەکانی ناوچەی شوان نەبووبوونە (ناوچە ڕزگارکراوەکان) ئەویش لەبەر باری جوگرافی زەویەکانیان کە تا ڕادەیەک لە ئاستی نزمی دابوو، ئەو ناوچەیە هەر جارە و لەژێر دەسەڵاتی یەکێک دابووە. جارێک پێشمەرگە، جارێکی تر هێزەکانی ڕژێم، هەروەها ببووە مۆڵگە و جێگای سەدان لەو کەسانەی کە لە ڕاژەی سەربازی هەڵاتبوون، گوندی دەلۆی ناو شوان کە خۆی هەشتا ماڵێک دەبوو نزیکەی پەنجا شەست سەربازی هەڵاتووی لێ بوو، ئەم گوندە پێشتر دووجار تێکدرابوو دووبارە دروستکرابۆوە، جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٦٣ و جاری دووەم ساڵی ١٩٧٦، ڕۆژی ٥ی مایس شاڵاوەکانی ئەنفال گەیشتە ئەو گوندە کە پێشتر بەشێوەیەکی چڕوپڕ بەموشەک و تۆپ و هەلیکۆپتەر بۆمباباران کران.

دواتر هێزی تایبەتی ٧٧ و هێزی زەمینی پێشڕەوییان کرد، هەندێک هەر لە ماڵەکانیاندا کوژران، لەم هێرشەدا بیست و هەشت کەس گیران و بێ سەروشوێن کران.

(ڕاپۆرت و بەڵگەنامە سەربازییەکان (١٣٨) سەد و سی و هەشت گوندیان باس کردووە کە لە ئەنفالی چوار سووتێنراون و ڕووخێنراون و پاکتاو کراون سەرەڕای ئەم وێرانکارییەی گوندەکان هەزاران ژن و منداڵ و پیر و گەنجیش شوونبزر کراون، بەپێی خەمڵاندنێک زیاتر لە ٢٥٠٠ دوو هەزار و پێنج سەد کەس لە دەشتی کۆیە و (٣٠٠٠) سێ هەزاریش لە ناوچەکانی شێخ بزێنی و قەڵاسێوکە و ناو شوان شوونبزر کراون).[١]

---

(١) د. ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧).

لەم شاڵاوەدا وەکو شاڵاوی پێشوو (سێیەم) سیاسەتی کۆکردنەوەی خەڵک پەیرەو کراوە، کە چەندین شوێنیان دەکردە مەڵبەندی مامەڵە و تاوتوێکردنی خەڵکەکە بۆ لە یەکتر جیا کردنەوە و ڕاگوێزانیان بۆ شوێنی نادیار، پتر لە سی مەڵبەند بۆ دەستگیرکراوان ئامادە کرابوو، گیراوەکانی گۆمەشین و گوندەکانی دیکە ماوەی سێ ڕۆژ لە هەرمۆتەی لای کۆیە هێشترانەوە، هەروەها خەڵکی دەربازبووی کیمیابارانەکەی ٣ی مایسی گۆپتەپە و عەسکەریش، کۆمەڵگەی تەکیەی لای چەمچەماڵ یەکەم قۆناغی ڕاوەستانیان بوو، کە بەنیڤا دەگوازرانەوە، هەروەها ناحیەی تەقتەقیش مەڵبەندێکی گرنگ بوو کە نزیکەی (١٠٠٠٠) ▪ هەزار کەسی لە گیراوانی باکووری زێی بچووکیان بۆ گواستەوە، پاشان بەپێی قسەی چەند شایەت عەیانێک کە خۆیان بینیویانە خەڵکەکەیان ڕەوانەی نامریەی کۆیە کردبوو کە قەڵایەکی سەربازییە وەک چەندین قەڵای لەم چەشنە لەوێ خەڵکی گیراوی پتر لە ١٢ دوازدە گوندی هەردوو لای زێ بەند کراون، پاشان ژن و پیاو لێک جیا کراونەتەوە و ڕۆژی پاشتر بۆ شوێنی نادیار گواستراونەتەوە شوێنێکی تریش کە سەدان خەڵکی تێدا کۆکرابۆوە شوێنی بەخێوکردنی ئاژەڵ بوو، لێرە هیچ لیکۆڵینەوە لەگەڵ خەڵکە گیراوەکە نەکراوە، لەبەر کەمی ژمارەی سەربازەکانیش نەتوانراوە ژن و پیاو جیا بکرێتەوە. شاڵاوی ئەنفالی چوارەم وێڕای زەرەری گیانی کە بەسەدان کەسی تیایدا شوونبزر کران، هاوکات زەرەروزیانێکی مادی زۆریشی لێکەوتەوە چونکە هەموو ماڵ و موڵکی خەڵکەکە تاڵان کران و عەقلیەتی شۆڤێنستی ڕژێمیش بەحەڵاڵ و ڕەوای زانی.

دۆڵی نێو چیاکانی شەقڵاوە و ڕواندز لە ١٥ی مایس تا ٢٥ ئابی ١٩٨٨.[١] دوای هەفتەیەک لە کۆتایی هاتنی شاڵاوی ئەنفالی چوارەم کە تیایدا ڕژێم زۆربەی زۆری خاکی کوردستانی داگیر کرد و گوند و دێهاتەکانیشی وێران کرد و خەڵکەکەشی شوونبزر کرد، ئەم جارەیان هێرشی کردە سەر دۆڵە سەخت و دژوارەکانی ناوچەی شەقڵاوە و ڕواندز. لە ناوەڕاستی مایسی ١٩٨٨ شاڵاوەکانی ئەنفال گەیشتە بالیسان و دۆڵەکانی دەوروپشتی کە بەتوندترین شێوە لەلایەن سوپاوە بۆردومان کرا، بەڵام خەڵکێکی زۆر وەکو شاڵاوەکانی ئەنفالی پێشوو دەستگیر نەبوون و شوونبزریش نەکران، چونکە ئەو دەمە ناوچە سنوورییەکانی پارێزگای هەولێر چۆڵ بوون و دانیشتوانی کوردیان لە دوو هەڵمەتی ڕاگواستن یەکەمیان لە ساڵانی ١٩٧٧-١٩٧٨ و دووەمیش لە ساڵانی ١٩٨٣-١٩٨٤دا ڕامالیبوو، هەروەها دۆڵەکانی باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ڕواندز خەڵکەکەیان بەزۆری چۆڵیان کرد پاش هێرشە کیمیاییەکانی نیسانی ١٩٨٧.

کاتژمێر ٦ی ئێوارەی ١٥ی مایسی ١٩٨٨ کە دوا ڕۆژی مانگی ڕەمەزان بوو خەڵکی خۆیان بۆ جەژن ئامادە کردبوو، کە پەلاماری سوپا دەستی پێکرد، فڕۆکەکان زۆر بەتوندی گوندەکانی (وەرێ، نازەنین، کاموسەک، ئەسپیندار، عەلیاو، سماقولی، بۆنێ)یان کیمیاباران کرد، بەتەنیا لە گوندی وەرێ ٣٦ کەس کوژران، گوندنشینێکی هەرتەل دەڵێت: کاتێ بەهاواری خەڵکی وەرێ چووین، چوار پێنج کەس لە ڕەزێکی نزیکی گوند لە ناوزینگدا بوون و گیانیان دەدا، سێ کەسیش مردبوون، کە گەیشتینە ناو گوندەکە دەبینین خواردن لە ماڵەکاندا هێشتا لەسەر ئاگرە،

---

(١) بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەم هێرشانە بڕوانە MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٢٩-٣٦١).

چەند ناژەڵ لەو ناوە مردار ببوونەوە. ئافرەتێکیش فڕۆکەکانی بینیبوو کە بۆمبەکانیان هاوێشتبووە وەرێ، ئافرەتەکە دەنگی بۆمبەکانی لا وەکو دەنگی ئۆتۆمۆبێلێک بووە کە زۆر بەخێرایی بڕوا و لەناکاو پێ بنێ بەبرێکەوە، پاشان لە ٢٣ی مایسدا شەپۆڵ شەپۆڵ فڕۆکە بۆمبی کیمیاییان باراندە سەر بالیسان و هیران و دۆڵەکانی دیکەی دەوروبەریاندا، بەلامارەکە زۆر سەخت بوو ئەوەش بووە هۆی کوژرانی هەندێک لەپێشمەرگە کە بنکە و بارەگاکانیان لەوێ بوو.

لە دوای ٢٠ی مایس سوپای عێراق لە چەند قۆڵێک هێرشی کردە سەر ناوچەکان، قۆڵی یەکەم بۆ گوندی گەرەوان کە نیازی شاخەکانی دەوروبەری و هەندرێن و کارۆخ بوو داگیریان بکات. قۆڵی دووەمیش لە ٢٣ی مانگ لە هەلەموند بۆ وەرتێ و زینێ گەلی و سەری ئەحمەدە دەربی و جاوەل و دەرەلە و کەلیتە، کە ئێوارەی ٢٣ی مایس گوندی وەرتێی کیمیاباران کرد، بەڵام قۆڵی سێیەم لە سەروچاوە و بەنی هەریر و خەلیفان بەشێوەی بازنەیی بوو، ئەم هێرشە نزیکەی (٧٢٠) حەوت سەدو بیست خێزانی دەربەدەر کرد و ماڵیشیان تالان کرا.

ئەوانەی لە ئەنفالی پێنج دەستگیر کران یا خود خۆیان دا دەست هەندێکیان لە سەربازگەی سپیلک و هەندێکیش لە گرتووخانەی ئەمنی هەولێر شوونبزر کران، بەڵام هێزەکانی ڕژێم نەیانتوانی وەکو لە ئەنفالەکانی پێشوو توانیان ڕێگا لە هاوڵاتیانی مەدەنی بگرن تاوەکو ڕا نەکەن، بۆیە زۆربەیان ڕێگای ئێرانیان گرتە بەر، دیارە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی جوگرافی ناوچەکە کە هەموو بەرنامە و مەرامەکانی ڕژێمی پووچەڵ کردەوە، بەڵگەنامەکانی ڕژێم ئەوە دەردەخەن کەوا شاڵاوی ئەنفالی پێنجەم سەرکەوتنی گەورەی وەدەست نەهێناوە ئەوەش لە بەڵگەنامەیەکی دوور و درێژی سەربازی دەردەکەوێ بەناونیشانی (شیکردنەوەی عەمەلیاتی ئەنفالی کۆتایی) کە ڕاپۆرتێکە (لیوا روكن یونس محمد الذرب) فەرماندەی فەیلەقی پێنج لە چەشنی (نەوپەڕی نهێنی و شەخصی) (سري

وشخصي للغاية). بۆ فەرماندەیی گشتیی سوپای ناردووە.

ڕاپۆرتەکە لە ناوەرۆکدا پێداچوونەوەیەکی بەکەفوکوڵە بۆ ئەو پەلامارە کەمتەرخەمییەی کە لە ناوچەکانی باکووری ژێر دەستەڵاتی KDP دا لە نێوان ٢٨ی ئاب و ٣ی ئەیلولی ١٩٨٨ ئەنجامدرا، وە کاتێک دێتە سەر ئەنفالی پێنجەم ئەوە باس لە ڕادەبەدەر دواخستنی پاکتاوکردنی کەرتی ڕواندز شەقلاوە دەکات، هەروەها وێنەی زنجیرە یەک لە دوای یەکەکانی قۆناغەکانی ئەنفال وەبیر دێنێتەوە.

دوای ئەوەی لە ٧ی حوزەیران شاڵاوی ئەنفالی پێنجەم کۆتایی پێهات ڕژێم خۆی بۆ ئەنجامدانی شاڵاوی ئەنفالی شەشەم ڕێکخست، لیوا ڕوکن ئەلزەرب بەم جۆرە پلانی ئەنفالی شەشەم لە نامەیەکی نهێنی و شەخسی ژمارە ١٤٧٥ لە ٣٠ی مایسی ١٩٨٨ بۆ سەرۆکایەتی دەستەی ئەرکانی سوپا ڕوون دەکاتەوە و دەنووسێت، پلان بۆ پرۆسێسێکی پاککردنەوە دانرا بەمەبەستی تێکشکاندنی تێکدەران لە دۆڵی بالیسان و ئالانەدا، بەڵام دواتر لە ٧ی حوزەیران داوا دەکات کە ئەو پرۆسێسە ڕابگیرێت و شاڵاوەکەش دوابخرێت تا کاتێکی گونجاوتر و لە بارتر، بەڵام سەرۆکایەتی دەستەی ئەرکان بەنامەی ئەوپەڕی نهێنی و شەخسی خۆی ژمارە ٥١٩ لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٨٨دا فەرمانی دا ئەخشەکە جێبەجێبکرێت بۆ تێکشکاندنی تێکدەران لە ناوچەکانی بالیسان و سماقولیدا.

دیارە هۆی سەرەکی ڕاگیرانی شاڵاوەکە ئەو بەرەنگاربوونەوەی هێزی پێشمەرگە بووە لە چیای کۆڕەک و دەوروبەریدا کە بەرزییەکەی نزیکەی ٧٠٠٠ مەتر دەبێت...

لایەنی هەرە گرنگی ئەم شاڵاوەی ئەنفالە هاتنە ناوە و دەست تێوەردانی ڕاستەوخۆی سەرۆکی ڕژێمی عێراق سەدام حوسێن خۆیەتی، چونکە لە بروسکە و نامە نهێنییەکەی جەنەراڵ ئەلزەرب هاتبوو کە شاڵاوەکە دووچاری گرفت و ئاستەنگ بووبۆوە، ئەوەتە ئەلزەرب لە نووسینەکەیدا

بەردەوام دەبێت و دەڵێت لە ڕاگەیاندنی نهێنی و شەخسی ژمارە ١٤٦٧١ لە ١٦ی تەموزی ١٩٨٨دا لە دیوانی سەرۆکایەتی کۆمارەوە کە دەستەی ئەرکانی سوپا بەنامەی نهێنی و شەخسی ژمارە ٨٦١ لە ٢٠ی تەمووزدا ئاراستەی کردووە پێیان ڕاگەیاندین کەوا عەمەلیاتی ئەنفالی لە دوای جەژنی قوربانەوە دەبێ بەگوڕ و تینێکی زۆرتر و قەبارە گەورەتر ئەنجام بدرێت...

بەڵام جەژنی قوربانیش تێپەڕی کەچی هێرشەکان هەر ئەنجام نەدەران، دواتر لە کۆبوونەوەیەکی یاریدەدەری سەرۆکی دەستەی ئەرکان بۆ کاروباری عەمەلیات و بەڕێوەبەری جموجۆڵی سەربازی کە لە ٢٩ی تەمووزی ١٩٨٨ لە بارەگای فەیلەقی یەک لە کەرکووک بەسترا تیایدا بەگوێرەی ڕاگەیاندنی نهێنی ژمارە ٩٤٣ لە ٢٩ تەمووزدا عەمەلیاتی ئەنفالی شەشەم و حەوتەم دواخرا بۆ ئەو کاتەی پێداویستییەکانی عەمەلیاتەکە دابین دەکرێن.

مەترسیترین و دژوارترین کات کە خەڵکی کوردستان تیایدا ژیا ئەو دەمەبوو کە شەڕی ئێران - عێراق ڕاوەستا کە ئەو کاتە لە سەروبەندی دەستپێکردنی ئەنفالی شەشەم و حەوتەم بوو، دوای ئەوەی لە ١٧ی تەمووزی ١٩٨٨ ئێران بڕیاری ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی، قەبوڵ کرد و دواتریش لە ٨ی ئابی ١٩٨٨ بەشێوەیەکی ڕەسمی شەڕ ڕاوەستا، ئەو بارودۆخە کاریگەرێکی نێگەتیڤانەی کردە سەر ورە و هێزی پێشمەرگە، ئەوە بوو پلانێک دارێژرا بۆ پاشەکشە کردن، چونکە هێزی پێشمەرگە باش دەیزانی کە سوپای عێراقی دەستی بەتاڵ بێت چ کارێک بەکورد دەکات ئەوە بوو هێزی ئاسمانی عێراق کەوتە هێرشکردنێکی زۆر سەخت و بەهێز، بەچەکی کیمیایی دیسان چیا و دۆڵەکانی بالیسان، مەلەکان، وەرتێ، هیران، سماقولی کوتا، ئەوانەی کە لەو ناوچانە بوون ڕایانکرد، موستەشارێک بەخەڵکەکەی ڕاگەیاند کە ئەگەر هاتو خۆیان بەدەستەوە بدەن و چەکەکانیان تەسلیم بکەنەوە ئەوا بەبەر لێبووردنەکە دەکەون و حکومەت لێیان خۆش دەبێت.

ئەوانەی بەو بانگەوازە بڕوایان کـــرد و خـــۆیان داوە دەست و دواتر دانپیانێکیان (اعتراف) پێ مۆرکردن کەوا بەڕاستی پێشمەرگەن هەموویان بێ سەروشوێن کران.

(لە میانەی شاڵاوی ئەنفالی پێنجەم و شەشەم و حەفتەم زیاتر لە (٢٥) گوند لە ناحیەکانی خەلیفان و ڕواندز و خۆشناوەتی وێران کران کە سەرجەم خێزانەکانیان (٢٦٠٢) دوو هەزار و شەش سەد و دوو خێزان بوو هەروەها ٢٤ قـوتابخـانە و ٥٢ مـزگـەوتی ئەم گـوندانە ڕووخـێنـرا. ئەمـە جگە لە سـووتاندن و فـەوتاندنی سـەدان دارگـوێز و داربەڕوو و ڕەز و باخ کـە سـەرچاوەیەکی بنەڕەتی ژێرخـانی ئابووری ئەوان بوون بەرەو نەمـان چوون). [1]

---

(١) د. ڕەشاد میران. م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٣).

## قۆناغی دووەمی ئەنفال

## شاڵاوەکانی ئەنفالی هەشتەم (ئەنفالی کۆتایی) ئەنفالی بادینان ٢٥ی ئاب تا ٦ی ئەیلولی ١٩٨٨[(١)]

وەستانی شەڕی عێراق - ئێران پاڵپشتێکی گەورە بوو بۆ عێراق، هاوکات ورە و تواناکانی هێزی سوپای بۆ ڕادەیەکی زۆر بەرز کردەوە، سەرکردایەتی ڕژێمی عێراق بەپەلەبوو بۆ تەواوکردنی پرۆسەی ئەنفال و کۆتایی پێهێنانی، عەلی حەسەن ئەلمەجید لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانی لەگەڵ سەرۆک جاشەکان لە هۆڵی ڕۆشنبیری و جەماوەر لە شاری هەولێردا کە فەرماندەی هەردوو فەیلەقی یەکەم و پێنجەم ئامادە بوونە لە ئابی ١٩٨٨دا بەموستەشارەکانی وتبوو کەوا پەلاماری ئەنفال ئێستا لە بادینان دەستی پێکردووە کە ناوچەیەکی شاخاوی باکوورە و سەنگەر و قەڵای مەحکەمی KDPی مەسعود بارزانییە، بەڵام بەفەرمانی خودی سەدام حوسێن کوردی بادینان دوا مۆڵەتیان درایە کە بگەڕێنەوە بۆ ڕیزی نیشتمانی، تێکدەران لەو ناوچەیە ئەگەر خۆ بەدەستەوە بدەن ئەوە بەبەر زەبی دەکەون، شایەنی باسە یاداشتێک لەلایەن ئەمنی سلێمانی لە ١١ی تەمووزی ١٩٨٨دا دەرچوو بوو کە چەسپاندنی ئەم سیاسەتە نوێیەی ڕژێمی دەردەخست سەبارەت بەخۆ بەدەستدانی تێکدەران، بۆ ئەم مەبەستەش ئەلمەجید چەند خاڵێکی ڕاگەیاندبوو کە ئەمانە بوون:

١- ئەو تێکدەرەی خۆی بەدەستەوە دەدات و چەکەکەی دەهێنێتەوە و ئەوەی کە لەو ناوچانە دەگەڕێتەوە کە تا ئێستا پرۆسەی ئەنفال نەیگرتووەتەوە لە هەموو تاوانێک دەبەخشرێ، بەو تاوانانەشەوە کە لە ئەنجامی کەمتەرخەمی و هەڵاتنەوە لە خزمەتی سەربازی بەرپا کراون.

٢- ئەو تێکدەرەی بێ چەک لەو ناوچانە دەگەڕێتەوە کەوا عەمەلیاتی

(١) بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەم هێرشانە بڕوانە، MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٣٧ - ٤٨٩).

ئەنفـــــال نەیگرتوونەتەوە لە تاوانی چوونە پاڵ تێکدەران و کەمتەرخەمی و هەڵاتن دەبەخشرێت.

٣- نابێ هیچ تەگەرەیەک بخرێتە رێی ناونووسین کردن لە فەوجەکانی بەرگری نیشتمانیدا.

لە راستیدا هەموو ئەو بەڵێنانەی کەوا رژێم لە سەردەتای ئەنفالەوە دابووی بۆ خۆ بەدەستدانەوە، هیچیان جێبەجێ نەکران و رێزیان لێ نەگیرا، تەنانەت زۆر لە هاولاتیان کە بەو پەیمان و بەڵێنانە باوەڕیان هێنا و خۆیان دا بەدەست، چارەنووسێکی شووم ڕوویانی تێکرد و شوونبزر کران.

دوای ئەوەی رژێم قۆناغی یەکەمی ئەنفالی تەواو کرد و، ئەوەی بەسەر کوردی هێنا، لە کوشتن و شوونبزر کردن و تالان و خانوو و ماڵ وێرانکردن، قۆناغی دووەمی ئەنفال دەستی پێکرد کە دەڤەری بادینانی گرتەوە سنووری شالاوی ئەنفالی بادینان لە رۆژئاواوە لە زاخۆوە تا ئامێدی درێژ بۆوە، لە باشوور و رۆژهەلاتیشەوە شێخان و ئاکرێی گرتەوە، بەهەزاران کەس لە هاولاتیان لە ترسی کیمیاباران و بێ سەروشوێنکردن ئاوارە و دەربەدەر بوون، بۆ ئەنجامدانی ئەم شالاوش جگە لە فەیلەقی پێنجەم کە بنکە و فەرماندەییەکەی لە شاری هەولێر بوو چەند بەشێکیش لە فەیلەقەکانی سێ و شەش و حەوت لە باشووری عێراقەوە گوازرانەوە بۆ ئەوێ. ئەم ناوچانە لەژێر دەسەلاتی هێزی پێشمەرگەی KDP دابوو، سروشتی جوگرافی سەختی ناوچەکە پێداویستی لۆجستیکی ئالۆز کردبوو کە مەرجە دابین بێت بۆ سوپایەکی نیزامی، بەلام پەلاماری دژ بەKDP لە هەندێ سەرەوە پتەوتر و داڕێژراوتر و راستەوخۆتر بوو لەوەی کە بۆ تێکشکانی PUK لە پێشوو سازکرا.

بەر لە دەستپێکردنی هێرشەکان هەموو ئەو یەکە و فیرقانەی سوپا لە نزیک شاری دهۆک کەوتە خۆ ئامادەکردن و چەند شوێنێکی بەبۆمبی هێشوویی بۆردومان کرد، لەوانەش گوندی سپینداری قەدپاڵی چیای گارە

که چەند کەسێکی لێ کوشت.

لە ئێوارەیەکی درەنگی ٢٤ی ئابدا بارەگای هێزی KDP لە زێوشکان کە لقی یەکی لێ بوو(*) بەر یەکەم هێرشی کیمیایی کەوت و (١٠) پێشمەرگە کوژران، بۆ بەیانیش ٢٥ی ئاب، فڕۆکە جەنگییەکانی ڕژێم لەیەک کاتدا چەند هێرشێکی جیاجیایان دەستپێکرد و بەخەستی ناوچەکەیان بۆردومان کرد، شایەت عەیانێک کە لەو ناوچەیدا بوو دەڵێت: لە هەمان شەودا کاتژمێر ٢، ٢٥ - ٢٦ / ٨ / ١٩٨٨ دوانزە فڕۆکەی ستونی هێرشی کردە سەر ئەو ناوچانە و ئامانجەکانیان بۆردومان کرد، مەبەستی سەرەکی ڕژێم لەو بۆردومانەدا بلاوکردنەوە و چاندنی ترس و دڵەراوکێ بوو لەنێو خەڵکیدا هەروەها ترسی ئەوەش هەبوو کەوا ڕژێم چەکی کیمیایی بەکاربهێنێت، هەروەک پێشووتر لە هەڵەبجە و قەرەداغ و بالیسان بەکار هاتبوون، لەم شەوەدا خێزانە هەلاتووەکان ئەوەندە زۆر بوون تەنانەت ڕێگا بەدی نەدەکرا).[١] هەروەکو چۆن لە قۆناغ و شالاوەکانی پێشووی ئەنفال چەکی کیمیایی دژی هاولاتیان بەکارهێنرا، بەهەمان شێوە لە دوا ئەنفالیشدا ئەم چەکە کۆکوژییە بەکارهات کە زەرەر و زیانێکی گیانی زۆری لێکەوتەوە، گوندی برجینێی ناحیەی زاوێتە لە ٢٥ی ئابدا

---

(*) KDP لە کوردستاندا چوار لقی هەبوو کە کاروباری سیاسی و سەربازیشیان لە ئەستۆ گرتبوو، زێوشکان بارەگای لقی یەکی لێ بوو، لقی دوو بنکەکەی لە دۆڵی سماقولی بوو و عەمەلیاتی پارێزگای هەولێری لە ئەستو گرتبوو، لقی سێ لە گوندی جافەرانی قەرەداخەوە کاروباری KDP لە پارێزگای کەرکوکدا بەڕێوە دەبرد، لقی چواریش لە ناوچەی چوارتابوو بەرپرسی پارێزگای سلێمانی بوو، جگە لە چەند لقێکی تر کە لە دەرەوەی کوردستان بوو، هەروەها KDP هەندێ هێزی تایبەتیشی هەبوو وەک هێزی بارزان لە ڕایات ناحیەی مێرگەسۆر. بروانە MEW لاپەڕە (٤٣٩) چاوپێکەوتن لەگەڵ هۆشیار زیباری، واشنتون دی. سی، ٧ی حوزەیرانی ١٩٩٣.

(١) رضا زبیر زیباری، الانفال والرحلە الشاقە، مطبعە هاوار، دهوک ١٩٩٥، ص (٨).

کەوتە بەر چەکی کیمیایی کە لە لایەن هەشت فڕۆکەوە بۆمبااران کرا ئەوانەی بۆردومانەکەیان بینیوە دەگێڕنەوە کە بۆمبەکان گەواڵ و دووکەڵی نێچگار گەورەیان لێ بەرز بۆوە، یەکەم جار سپی و ڕەش بوون پاشان زەرد هەڵگەڕان بەشێوەیەکی ستوونی پەنجا شەست یارد لە ئاسماندا بەرزبوونەوە ئەوجا دووکەڵەکە بەناو دۆڵەکەدا بلاوبووەوە و دواجار نزم بۆوە و بەناو گوندەکەدا تێپەڕی و کەوتینە بۆن کردنی گازەکە. سەبارەت بەبۆنەکەش وا دەگێڕنەوە کە لە سەرەتادا زۆر خۆش بووە، بۆنی سێو و شتی شیرینی لێ دەهات، بەلام زۆری پێ نەچوو کە تاڵ بووە و کاری کردە سەر دەم و چاو و پێستمان لەناکاو هەناسەشمان سواربوو.

چەند میلێک لە باکووری برجوینەوە، گوندی (تلاکرد) بەهەمان شێوە لەلایەن فڕۆکەکانی عێراق کیمیاباران کرا و چەند کەسێک تیایدا بوونە قوربانی و کوژران، هەروەها هەردوو گوندی (سپێندارۆکە و بەر کەڤرێ) کە لەیەکتر نزیکن لەلایەن دوو فڕۆکەوە بەخەستی کیمیاباران کران، لە ئەنجامدا چواردە پێشمەرگە و هاولاتییەکی مەدەنی کوژران.

بەشێوەیەکی گشتی نزیکەی (٥٠) پەنجا گوند بەر خەستترین هێرشی کیمیایی کەوتن وەک (وەرمێلێ، بلێجانیێ بانێ، باوەرکا کەڤری، مێرگەتوی، هەڤنێکا، بیرۆزانا، دریێرشێ، مێزێ، سپیندار، خەلیفۆ، گەرگەش، گارەگۆ، گۆرە، زێوەشکان، بەلوتی، گیزێ، زارکێ، ڕەزیکێ، سارتکێ، ماردێنیا، شێرانە، یەکمالە، سوارێ، ناڤۆک و چەند گوندێکی تر.).

دیارە بەسەدان کەس لە ئەنجامی ئەو هێرشانەی کە بەچەکی کیمیایی کرانە سەر گوندنشینەکان گیانیان لەدەست دا، زۆری ئەو قوربانیانەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆی ئەوەی کە هەردوو گازی خەردەل و دەمارە گازی سیانید تێکەڵ بەیەک کرابن، هەروەها هەندێک لە پسپۆڕان وای بۆ دەچن کەوا لەوانەیە دەمارەگاز (غاز الاعصاب) GB کە بەگازی سارتیش دەناسرێت لەو هێرشانەدا بەکار هاتبێت.

خەڵکی ئەم دەڤەرە بەرەو ڕێگای بێگوڤاکانی ماسی هەڵاتن، تا کاتژمێر ٢ی شەوی ٢٥ - ٢٦ / ٨ / ١٩٨٨ خەڵکەکە توانیان دەربازبن، بەڵام دواتر سوپای عێراقی ئەو ناوچانەی داگیر کرد و ڕێگای دەربازبوونی خەڵکەکەی گرت.

باشترین شت کە هێزی پێشمەرگەی KDP کردی ئەو زنجیرە شەڕە بوو کە تیایدا پێشمەرگەکان هەوڵیان دەدا کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەر پێشڕەوی سوپا و خاوی بکەنەوە، بەڵام فڕۆکەکانی ڕژێم لە دوای پێشمەرگەکان بوو ناچاریان کردن کە ئەو ناوچانە بەجێ بێڵن لە کۆتایی ڕۆژی ٢٦ی ئاب شەڕ کۆتایی پێهات، بەڵام ناوچەی بادینان بەتەواوی لە بەرەبەیانی ٢٨ی ئابدا داگیر کرا.

لە ئەنجامدا دەیان هەزار خەڵکی مەدەنی ئاوارە و دەربەدەری تورکیا بوون ئەوانی تریان لە ماڵەوە دەستگیر کران، یان پاش ماوەیەکی کەم خۆیان بەدەستەوە داو دواتریش شوێنبزر کران.

(هەر لە ٢٦ی مانگدا ئەو خەڵکە لەسەر سنووری تورکیا گیرسایەوە، دەسەڵاتدارانی تورک سەرەتا نەیانهێشت خەڵکەکە بچنە ناو سنووری تورکیا، بەڵام دواتر ناچاربوون کە ڕێگایان بدەن، نزیکەی ٦٥٠٠٠ تا ٨٠٠٠٠) هەزار کەس توانیان بچنە ناو تورکیاوە، ئەویش دوای ئەوەی خەڵکەکە فشارێکی زۆریان خستە سەر جەندرمە و سەربازەکانی تورک کە بووە هۆی ئەوەی لێرە و لەوێ چەند پێکدادانێکیش لە نێوانیاندا ڕوو بدات. خەڵکەکە ترسی ئەوەشی هەبوو کە ڕژێمی تورکیا تەسلیم بەعێراقیان بکاتەوە، دواتر لەو کەمپانەی کە بۆیان دروستکرا نیشتەجێ کران، هەروەها خەڵکی کوردستانی باکوور یارمەتییەکی زۆری خەڵکە ئاوارەبووەکانیان دا و زۆر لە مەینەتی و خەمەکانیان ڕەواندنەوە).[1]

---

(١) عەلی بەندی، ئەنفالکرنا بەهدینان، چ (١) چاپخانەی خەبات، دهۆک، ٢٠٠١، لاپەڕە (٦٧).

ئەوانەی خۆیان دا دەست سوپا یان دەستگیر کران، زۆربەیان بەرەو چارەنووسێکی نادیار ڕۆیشتن، سەبارەت بەشوێنبزر کردنی خەڵکی بادینان بەزۆری ڕەگەزی نێرینە دەگرێتەوە، بەڵام لە ناوچەی دۆسکی لە گوندی کۆرفێل ئەفسەرێک (٣٥) سی و پێنج کەسی لە ژن و پیاو گوللەباران کرد.

ئەفسەرێکی پێشووی سوپای عێراق کە پلەکەی کۆلۆنێلە (عەقید) بە(MEW)ی ڕاگەیاندووە کە فەرمانیان بۆ هات هەرچی پێشمەرگەیە بیانکوژین، تەنانەت ئەوانەشیان کە خۆ بەدەستەوە دەدەن، هەروەها ئەو جوتیارە مەدەنیانەش کە لە ناوچەی قەدەغەکراودا بوون هەر پێشمەرگە دانرابوون واتە تەواوی پیاوە تەمەن (١٥ تا ٦٠)ساڵیەکان، ئەم فەرمانە تا ئاستی فیرقەکان بەنووسراوی ڕەسمی دابەزیبوو ئەفسەرە پلە نزمەکانیش بەزار (شفوي) ئاگادار کرابوونەوە، ئەم فەرمانە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر حوکمی قەرەقوشی ڕژێمی عێراق و ئەنجامدانی سیاسەتی قڕکردنی (جینۆساید) گەلی کورد.

گوللەبارانکردنی گیراوەکان لە ئەنفالی بادینان بەشێوەیەکی بەرچاو و ئاشکرا ئەنجامدراوە، ئەوەتە کارەساترین شێوە لە گوندی کوڕێمی ڕووی داوە دوای ئەوەی خەڵکەکە خۆی داوەتە دەست سوپاوە (٣٣) سی و سێ پیاو و کوڕی هەرزەکار کە تەمەنیان لە نێوان (١٣-٤٣) ساڵیدابووە لەلایەن ئەفسەرێکی سوپاوە کەوا پێدەچێت دوای قسەکردن بەنامێری لاسلکی هۆکی تۆکی فەرمانی پێدراوە گوللەبارانیان بکات، بەم جۆرە ئەفسەرەکە لەو جێگایەدا ٢٧ کەسیان لێ گوللەباران دەکات و شەشەکەی تریش دەرباز دەبن. لە گوندی مێرگەتوشدا بەهەمان شێوە دوای ئەوەی خەڵکەکە دەستگیر دەکرێت ژن و پیاو لە یەکتری جودا دەکرێنەوە دواتر ئەو پیاوانەی کە تەمەنیان لە ژوور پازدە ساڵی دابووە دەسبەجێ گوللەباران کران.

ئافرەتێکی گیراوی بەندیخانەی سەلامیەی شاری موسڵ کەوا پێدەچێت

نزیکەی ( ١٢٠٠٠ ) هەزار بەندکراوی لیَ بووبێت دەگێڕتەوە کە پیاوەکان لەم بەندیخانەیە بەدەست و چاو بەستراوی ڕاپێچی ناو ئۆتۆمۆبێلی پەنجەرە تاریک کران و بۆ شوێنی نادیار بردران پاش ماوەیەکی کەم دەنگی دەستڕێژی گوللە دەستی پێکرد کەوا پێدەچێت کۆمەڵکوژیان کردبن.

بەم جۆرە شاڵاوەکانی ئەنفال، بەئەنفالی بادینان لە ٦ / ئەیلولی ١٩٨٨ کۆتایی پێهات، ئەم ئۆپەراسیۆنە قاتوقڕییە کوردستانی وێران کرد و ژێرخانی ئابووریشی لە بنەچەوە هەڵتەکاند، ئەنفال تاوانێک بوو کە دنیا بێدەنگی لێکرد، بەڵام مێژووڕووداوێکی وابوو مەحاڵە کە لەیاد بکرێت.

# بەشی پێنجەم

## ئافرەت لە کۆمەڵی کوردەواریدا

گەلێک جار و لە زۆر شوێن و بۆنەدا ئەم پرسیارە خۆی دووبارە دەکاتەوە و لە دوای بەرسڤێکی زانستی و مەنتیقیانەش دەگەڕێت ئەویش ئەوەیە بۆچی ئافرەتی کورد دوورەپەرێزە لە گشت مەیدانەکانی ڕاپەڕاندنی کاروباردا و وەکو پێویست نەیتوانیوە ڕۆڵی سەرەکی خۆی لە کۆمەڵگەدا ببینێت: ؟ ڕەنگە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەوەندە ئاسان نەبێت ڕۆشنکردن و شیکردنەوەی ناوەرۆکەکەی زۆر گوزارشت و مانا هەڵبگرێت، تەنانەت وەڵامدانەوەکەی پێویستی بەوردەکاری و لێکۆڵینەوە هەبێت، لەمەشدا مێژوو وەک سەرچاوە ڕۆڵی خۆی دەبینێت، چونکە ڕشاژۆکردنی مێژوو پیاچوونەوە پیایدا زیاتر وەڵامەکەمان بۆ ئاسان دەکات. ئاشکرایە ڕابردوو و دیرۆکی نەتەوەی کورد سەدان داستانی ئەبەرد و قارەمانانەی تیادا تۆمار کراوە کە تاوەکو ئەمڕۆش هەر بە ئەمری ماوەتەوە، ئافرەتیش شان بەشانی پیاو تیایدا ڕۆڵی بەرچاوی خۆی لە قۆناغە جیا جیاکانی ئەم داستان و مێژووە شکۆدارەدا بینیوە و بونیادنەری ئەم ڕابرووە بووە کە تاکو ئەمڕۆش نەتەوەکەمان شانازی بەو شێرە ئافرەتانەی وێنەی خانزادی میری سۆران و حەپسەخانی نەقیب و قەدەم خێر و لە مێژووی ئەمڕۆشمان لە نموونەی لەیلا قاسم و دایکە ئامینە و دەیان و دەیانی تر دەکات.

کۆمەڵگەی کوردەواری کۆمەڵێک بنەماو تایبەتمەندی خۆی هەیە کە لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تر لێک جیا دەکرێنەوە، بێگومان چین و توێژەکانی ئەو کۆمەڵەش هەر یەکە و بەپێی (ئەرک و مافەکانیان) ڕۆڵ لە پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگەیەدا دەبینن. ئێمە لێرەدا باسەکەمان (ئافرەتە) کە وەکو توێژێکی سەرەکی لە بنیادنانی کۆمەڵگەدا ڕۆڵی خۆی دەبینێت و شان بە شانی توێژەکانی تر هەڵسوکەوت دەکات و بوونی خۆی تاڕادەیەکی

باش لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا تواندووە و نیشان داوە.

ئافرەتی کورد هەر لە سەرەتاوە ئافرەتێکی زەحمەتکێش بووە و گەلێ ئەرکی لەسەر شانە وەک ئەوەی کە دایکە، منداڵ بەخێوکەرە، کارکەرە لەنێو ماڵ و دەرەوە، ئیشی کشتوکاڵ و بازرگانی و میوانداری و مەڕوماڵات و گەلێ جار ئیش و کاری پیاوانیش دەکات، چونکە هیچ کاتێک هۆش و لەشی ئافرەت لە هی پیاو کەمتر نەبووە بەڵکو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکە وای کردووە کەوا وەکو پاشکۆیەکی پیاو تەماشا بکرێت و مامەڵە و سەودای لەگەڵدا بکرێت بۆیە لەم بارەیەوە د. نەوال سەعداوی دەبێژێت: (هیچ بەڵگەیەکی زانستی بایلۆجی و فسیۆلۆجی لەبەر دەستدا نییە ئەوە بسەلمێنێ هۆش و لەش و دەروونی ئافرەت لە هی پیاو کەمترە، بەڵکو ئەم خەسڵەتە کەم لایەنە نزمییەی لە سەری دابڕاوە لە ئەنجامی هۆکارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بۆی پەیدا بووە.)[١]

جیاوازی سروشتیش لە نێوان ئەندامەکانی لەشی ئافرەت و پیاودا هەر وەک لە نێوان گشت گیانەوەران و زیندەوەراندا هەیە لایەنی کزی و بێ دەسەلاتی ئافرەت نییە بەڵکو سیفاتی سروشتی و تەواوکەری خەسڵەتەکانی نێر و مێ دەردەخا.

ئەگەر کەمێک بۆ دواوە بگەڕێینەوە و شەن و کەوێکی بارودۆخی کۆمەڵگەی کوردەواری لەو کاتدا بکەین و تێڕوانینێکی خێرا لەسەر ڕەوشی ئافرەت و ڕۆڵی لە کۆمەڵدا بخەینە ڕووەوە ئەوا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئافرەتی کورد وەک زۆربەی ئافرەتانی جیهان بەدرێژایی مێژوو گیرۆدەی بێ مافی و جەور و ستەمی کۆمەڵ بووە، هیچ کاتێک خاوەن دەسەڵات و بڕیاری کۆتایی تایبەتی خۆی نەبووە، بەڵکو هەمیشە

(١) د. نوال السعداوي، الانثى هي الاصل، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ص (١٨).

وەک پاشکۆیەکی پیاو سەیر کراوە و بێبەش کراوە لە زۆر ماف و پێوەند بووە بەهەموو ئەو دەسەڵاتانەی کە لە سەری بووە و هەر هەڵگەڕانەوەیەک یاخود دەنگ بەرزکردنەوە و ناڕەزایی دەربڕینێک بووەتە هۆی ڕیسوا بوون و دەمکوتکردنی تەنانەت دابڕانیشی لە کۆمەڵدا.

ئاشکرایە کۆمەڵگەی کوردەواری لە بنەڕەتدا کۆمەڵگەیەکی لادێ نشینی کشتوکاڵییە و پابەندیشە بەکۆمەڵێک دابونەریتی داسەپاو بەسەریا، ئافرەتی لادێ نشین بووەتە قوربانی ئەم دابونەریتە کۆن و زەمەن بەسەر چووانە، بۆیە گیروگرفتی دواکەوتنی ئافرەتی لادێ نشین لە کۆمەڵگەی کوردەواری لە ڕووی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابوورییەوە نیشانەیەکی ترسناک بووە لەبەردەم ڕێبازی ڕاپەڕینی هاوچەرخانەی سەرجەمی کۆمەڵدا و کاری کردۆتە سەر هەموو لایەنەکانی ژیان و دواخستنیشی لە ڕەوتی بەرەو پێشڤەچووندا (چونکە دۆخی پاشکەوتن و پاشکەوتوویی مانەوەی ئافرەت زیان بەمەسەلەی پێشکەوتنی کۆمەڵ ئەگەیەنێ و ڕێبازێکی زیانبەخشانەیە و پێچەوانەی بیروباوەڕی شۆڕشگێری و دیموکراتیانەشە، بۆیە پێویستە ئافرەت لە هەموو بارودۆخێکدا لە ڕووی تیۆری و پراکتیک و مافەوە سەربەست بکرێ بۆ ئەوەی گۆڕانێکی ڕیشەیی لەناخی کۆمەڵدا بەرپابێت و هاوکات ببێتە پارسەنگ و لایەنێکی گرنگی مەسەلەی ئەو ڕزگاربوونە گشتییەی تێکڕای کۆمەڵ لە ڕووی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەوە).[1]

دیارە هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ عەقلیەتی پیاوسالاری لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا کە تاوەکو ئێستاش ئاسەوارە سلبیەکانی بەئاشکرا دیارە کە بێگومان (ئەو سیستەمە ترسناکە - پیاوسالاری - پەیوەست بەکێشەی ئەوەکان و نوێ بوونەوەیان پیاو و ئافرەت بەقەد یەک دەچەوسێنێتەوە، کە

---

(١) برهان قانیع، بنچینە کۆمەڵایەتییەکانی ئافرەتی لادێ نشینی کوردەواری، بەغدا ١٩٧٩، لاپەڕە (٦).

ئەمەش پابەندە بەباری ڕۆشنبیری و هۆشیاری کۆمەلایەتی و باری ئابووری هەر کۆمەڵگەیەک).[1]

بێگومان ئەو سیستەمە ترسناکە، هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ دابڕانی تەواوی ئافرەت لە ڕووی داهێنان و ئەفراندنیشەوە، لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا، ئەوەتە سەرکوتکردنی کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد وای کردووە کە بیرکردنەوەیان پیاوانە بێت و لە کۆمەڵگەی پیاوسالاریدا ئەوێران باس لە هەست و خەون و خولیای خۆیان بکەن و بە بڤەی بزانن.

دیارە ئەوەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕابردووی ژیانی کورد بەگشتی (چونکە ڕوون و ئاشکرایە کە کوردستانی دایک چۆن کراوە بەچوار پارچە لەلایەن دوژمنانی کورد و نەتەوەی کوردیش بەدرێژایی مێژوو چەوساوەتەوە ئەمەش بۆتە هۆکارێک بۆ دروستکردنی چەندەها دابونەریتی کۆنەپەرست و دواکەوتووی لەنێو عەقلیەتی کۆمەڵی کوردەواری هەر لە دێرزەمانەوە، بێگومان ئەم دابونەریتانە زیاتر فشاریان خستۆتە سەر ڕۆڵی ئافرەت و پووکاندوویانەتەوە دووریان خستۆتەوە لە هەوڵدان و بونیادنانی کۆمەڵێکی پێشکەوتوو و زامنکردنی دواڕۆژێکی ڕووناک بۆ نەوەکانی ئێستا و داهاتوویان).[2] هەڵبەتە ئەم ڕەفتار و شێوازەی کۆمەڵ جۆرێکە لە جۆرەکانی نەخۆشی کۆمەلایەتی کە دوژمنانی کورد ڕەگوڕیشەیان لەنێو ناخی مرۆڤی کورددا چەسپاندووە و هەمیشە وایان لە کۆمەڵ کردووە کە ئافرەت بچەوسێنێتەوە و هیچ مافێکی خۆی پێ نەدات تەنانەت لە خوێندن و لە ماڵ دەرچوون و هەتا مافی هەڵبژاردنی هاوسەریشی پێ ڕەوا نەبینرێت. بۆیە تاوەکو کۆمەڵ لە هەموو ئەو کۆت و زنجیرانەی کە تیایدا ئاخنراوە ڕزگاری نەبێت ئەوا مەحاڵە ئافرەت ڕزگار ببێت و بتوانێت ڕۆڵی

---

(1) ئەجات حەمید، بازنەی قەدەغەکراوەکان... ئەو مرۆڤەی ناوی ئافرەتە. گۆڤاری دەنگی ئافرەت ژ (15) ساڵی 1988، لاپەڕە (22).

(2) شیلان مستەفا، ئافرەت و ڕۆڵی کاریگەری لە کۆمەڵدا، گۆڤاری قەرەچوغ ژمارە (5)، بەهاری 2000 لاپەڕە (36).

خۆی له کۆمەڵگەدا ببینێت. بنیادنانی کۆمەڵێکی تێگەیشتوو و ڕۆشنفکر تەنها ئەرکی پیاو نییه بێگومان تەنها بەئەویش ناکرێت چونکه پیاو و ئافرەت تەواوکەری یەکترن و هیچیان بەبێ ئەوی تر ناتوانێ هەڵ بکات و ئیشوکارەکانی بەڕێوه ببات.

وەلێ ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر هەیه دەبێت دانی پیا بنێین ئەویش ئەوەیه که هەر چەنده بارودۆخی ئافرەتی کورد خراپ و دژوار بووه بەڵام بەبەراورد لەگەڵ چەندین وڵات که تەنانەت ئەندامیشن له نەتەوه یەکگرتووەکان دەبینین ڕەوشی ئافرەتی کورد، له ڕووی پێکهاته کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەیەوه زۆر باشتره هەر بۆ نموونه له زۆر وڵاتان و تەنانەت وڵاتانی ناوچەکەش ئافرەت بۆی نییه بەشداری له هەڵبژاردنەکان یا خۆی بۆ پۆسته حکومی و پەرلەمانتارییەکان کاندید بکات.

(ئافرەتی کورد بەحوکمی باری جوگرافی ناوچەکه و دابونەریتی خۆی هەمیشه شان بەشانی پیاوان له بوارەکانی کار و گوزەران و ژیان بەڕێوەبردندا بەشدار بوونه و له هەمان کاتیشدا ڕۆڵی جوامێرانه و بەرچاویان له ئیدارەی کاروباری سیاسیدا نواندووه، ئافرەتی کورد له شۆڕشی ئەیلولدا پشت و پەنای پێشمەرگه بوو بەڵکو هەر خۆشی شەرەفی پێشمەرگایەتی پێ بەخشراوه تا ئەو کاتەی (بارزانی ئەمر) فەرمووی: ئەو ئافرەتەی نان بۆ پێشمەرگەش دەکات هەر پێشمەرگەیه).[1]

سەرنجێکی خێراش بۆ ڕابردوویێکی نزیک، دەبینین ئافرەتی کورد بەش بەحاڵی خۆی له کۆڕی خەبات و تێکۆشاندا درێغی نەکردووه و بەڵکو زۆر هەوڵی داوه بۆ ئەوەی دەنگی بگاته هەموو جیهان و بێ مافی و ستەمی خۆی ڕابگەیەنێت.

ئەوەته (حەپسەخانی نەقیب له بیست و سییەکانی سەدەی بیستەم

---

(١) فەیسەڵ دیهاتی، کورد له سیستەمی نوێی جیهاندا، کوردستان، هەولێر ٢٠٠١، لاپەڕه (٢٤٥).

چەندین جار نامەی تایبەتی ناردووە بۆ بارەگای یەکێتی نەتەوەکان لە جنێف و تیایدا باسی ئەو جەوروستەمە زۆرەی کردووە کە بەسەر کورد هاتوون، ئەو نامانە ئێستا بوونەتە بەڵگەی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی نوێی گەلەکەمان. هەروەها مینا خانی هاوسەری پێشەوا قازی محەمەدی ئەمر لە ڕۆژگاری کۆماری مەهاباد دا جێگەی حەپسەخانی نەقیبی گرتبۆوە وا دیارە خەریکی دامەزراندنی یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتان بووە). [1] بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستانی ئازادی دوای ڕاپەڕین تەکانێکی باشی بەرەوشی ئافرەت لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی داوە و بەڵکو زۆریشی بەرەو پێشڤە بردووە، ئەو هەلومەرجەی کە ئەمڕۆ بۆ گەلی کورد ڕەخساوە لەو نێوەندەشدا ئافرەتیش گەلێک دەرگای بەڕوودا کرانەوە و لەو کۆت و زنجیرە بەقەفانەی کە تێی ئاخنرا بوون دەتوانین بڵێین ڕزگاریان بوو - ئەگەر ڕزگاربوونێکی کاملیش نەبوبێت - ئەمڕۆ هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنی دنیادا و پەیدا بوونی عەولەمە ئافرەتانیش لە دنیای تەکنەلۆژیا و ڕۆشنبیریدا ڕۆڵێکی دیاریان هەیە ئەخاسمە بۆ بەرجەستەکردنی قەوارەیەکی تایبەت بەخۆیان لە گشت بوارە جیا جیاکاندا ئەمە وێڕای بەشداریکردنێکی بەرچاو لە بواری ڕۆشنبیری و سیاسی و کولتوریدا. ڕۆڵی ئافرەتی کورد ئەمڕۆ هیچی لە ڕۆڵی پیاو کەمتر نییە بەوەی کە نیوەی کۆمەڵە و لە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و زانیاریدا لە سەنگەری پێشەوەدیە.

ئەمڕۆ ئەگەر سەیری دامودەزگای زانستی و ڕۆشنبیری و بەرهەمییەکان بکەین دەبینین ئافرەت گەلێک بۆشایی لەم شوێنانە پڕ کردۆتەوە، جا چ لە مەیدانی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەری بێت یا لە مەیدانی کۆمەڵایەتی و بەرهەم هێنان و زانیاریدا بێت، جگە لەمانە ئافرەتی کورد ئەمڕۆ دەیەوێ لە حوکمڕانی دەوڵەتی یاسادا بۆشاییەکان پڕ بکاتەوە، ئەوەتە لە پەرلەمان

---

(١) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ئافرەت لە مێژوودا، کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی، چاپخانەی الحوادث بەغدا / ١٩٨١، لاپەڕە (٧٩).

و ئەنجومەنی وەزیراندا ئافرەتی کورد ڕۆڵێکی بەرچاو و کاریگەر لە ڕووی یاسادانان و جێبەجێکردندا دەبینن و ئیش و کاردکانیان مایەی خۆشحاڵی و ڕێز لێگرتنە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەخاڵێکی گرنگ بکەین ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەوانەی باسمان کردن مانای ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەتی کورد گەیشتۆتە لوتکە و ترۆپک و هەموو شتەکانی تایبەت بەخۆی کۆنترۆڵ کردووە و ئیتر تەواو هیچ کەموکورییەک لە ڕێگای ئەودا نەماوە، بەڵکو پێویستە زیاتر هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری و ڕۆناکبیری خۆی بدات تاوەکو ببێتە ئەندامێکی کاریگەری کۆمەڵ بۆ دروستکردن و بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی هاوچەرخ و بەتێگەیشتن و ڕۆشنبیری خۆی دەبێ بزانێ کە دەتوانێ ڕۆڵێکی سەرەکی ببینێ لە گۆڕینی باری کۆمەڵایەتی و شارستانی نێو کۆمەڵگە بەپێی بیرکردنەوەی لە ماف و ئەرکە تایبەتییەکانی.

هەڵبەتە نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەهەموو پێوەرەکانییەوە لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە مافە بنچینەییەکان بۆ توێژی ئافرەتان دەستەبەر بکات بەبێ هیچ جیاکارییەک ئەوەتە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێککەوتننامەیەکی بەناوی جیاکاری دژی ئافرەت (التمییز ضد المرأة) مۆر کردووە کە تیایدا مافەکانی ئافرەت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هاتووە و جەخت لەسەر دەستەبەرکردن و بەجێهێنانی کراوەتەوە، لە سەرەتای ئەم ڕێککەوتنەدا هاتووە کە (مافەکانی مرۆڤ بۆ ئافرەت و کچان بەشێکن لەو مافە جیهانییانەی مرۆڤ کە نابێ دەستیان لێ بدرێت و بەشێکی جیا نەکراوەن لەم مافانە و تەواو بەشداریکردن و بەیەکسانی لە ژیانی سیاسی و شارستانێتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆناکبیری لە ئاستی نیشتمانی و ناوچەیی و نێودەوڵەتی و ڕیشەکێشکردنی هەموو شێوەکانی جیاکاری لەسەر بنچینەی توخم دوو ئامانجی لە پێشتری کۆمەڵی نێو دەوڵەتین).[1]

---

(١) جێکاری دژی ژن، ناوەندی مافەکانی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەولێر - ٢٠٠٠، لاپەڕە (٣).

هەر وەک باسمان کرد ئافرەت بەهۆی فاکتەرە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەکانیشەوە دوچاری گەلێک کێشە و گیروگرفت بوونەتەوە و بەدەستییەوە دەناڵێنن کە گرنگترینیان ئەمانەن:[1]

**یەکەم**: خراپی باری ئابووری خێزان.

**دووەم**: نەبوونی رادەی رۆشنبیری ئافرەت و نەخوێندەواری کە ئەمە خۆی لە خۆیدا کێشەیەکە لەبەردەم بەڕێوەبردنی خێزان.

**سێیەم**: جیاوازییەکی زۆر لە تەمەندا لە نێوان ژن و مێرددا، هەروەها پەیرەوی کردنی دیاردە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکانی تر وەک ژن بەژن و گەورە بەگچکە و شیربایی و ژن بەسەرهێنان و هتد...

**چوارەم**: بەزۆر بەشوودانی ئافرەت بەبێ ڕەزامەندی خۆی، هەر وەک ئاشکرایە لە کۆمەڵی ئێمەدا هەتا ئێستا ئافرەت ناتوانێ هاوسەر بۆ خۆی دەستنیشان بکات بەشێوەیەکی سەربەست.

**پێنجەم**: نەبوونی رادەی رۆشنبیری سێکسی (الثقافة الجنسية) لە نێوان ژن و پیاودا کە ئەمەش کێشەی گەورە دروست دەکات ئەمانە و گەلێک خاڵی تر کە وای کردووە ئافرەت بەشێوەیەکی پەراوێزی لە کۆمەڵدا بمێنێتەوە و شێوازێکی گۆشەگیری بەخۆیەوە بگرێت.

---

(١) راپۆرتی ASK بۆ: مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان سالی ٢٠٠٠، چاپی یەکەم ٢٠٠١ لاپەڕە (٩٠).

# بەشی شەشەم

## ئامانجی ڕژێمی عێراق لە ئەنفالکردنی ئافرەتدا

کارەساتی ئەنفال - وێڕای ئەو هەموو تاوانانەی دەرهەق بەنەتەوەی کورد ئەنجامدراوە - زیاتر برینی کوردانی قوڵتر کرد و ئاسەوارێکی نێگەتیڤانەشی لەسەر ڕوخساری کۆمەڵگەی کوردەواری جێهێشت و هەروەها کاریگەرییەکی گەورە و بەهێزیشی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستاندا نواند کە خێزان بەپلەی یەکەم دێت. چونکە خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگەیە و کۆمەڵیش لە ڕێگەی خێزانەوە دەتوانێت زۆر لە ئەرک و مافەکانی جێبەجێ بکات و بەسەریاندا زاڵ بێت، هەروەها (خێزان بناغە و بنەڕەتی دروستبوونی هەموو نەتەوەیەکە کە بەچەند قۆناغێک تێدەپەڕێ و بەسەری دادێ تاکو نەتەوەکە دروست دەبێت، ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر خێزان گرنگیەکەی لەوە دایە، بەتایبەتیش لە کۆمەڵی کوردەواریدا کە بەچەند ئەرکێکی زۆر بنەڕەتی و سەرەکی هەڵدەستێ لەوانە پەروەردەی منداڵ و نەوەی نوێ بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرک و کارانەی پێیان دەسپێردرێت هەروەها گواستنەوەی دابونەریت و کولتوری نەتەوەیی لە نەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر لە ڕێگای خێزانەوە دەگوازرێتەوە، پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ لە ڕێگای خێزانەوە بەشێوەیەکی گشتی دروست دەبێت بۆیە خێزان گرنگترین و کاریگەرترین دەزگای ناو کۆمەڵ دەبێت)[1]

دیارە ئافرەتیش وەکو توێژێکی سەرەکی کۆمەڵ و ڕەگەزێکی کاریگەر تیایدا بەشی هەرە زۆری ئەو زەرەر و زیانانەی بەرکەوت و بووە قوچی قوربانی ئەو ئۆپەراسیۆنە بەدناوە، ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی ئەنفال لەسەر ئافرەت تاوەکو ئەمڕۆ بەردەوامە و بەڵکو ڕۆژ دوای ڕۆژ لە زیادبووندایە بەتایبەتی ئەو ئافرەتانەی کە پیاوەکانیان تاوەکو ئێستا بێ سەروشوێنن و

(١) د. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٧).

ڕووبەڕووی کۆمەڵێک گیروگرفتی خێزانی بوونەتەوە و چارەنووسیان نادیارە، هەروەها ئەو ئافرەتانەی لە کاتی ئۆپەراسیۆنەکە بەر شالاوەکە کەوتوون و گیران و لە بەرامبەریاندا ئەوپەڕی بێ ویژدانی و تەنانەت سووکایەتیشیان دەرهەق ئەنجامدرا، دیارە ئامانجی سەرەکی ڕژێمی عێراق لە ئەنجامدانی ئەم کردارە بەد ئەخلاقییە تەنها بۆ ئەوە بووە کە بنەماکانی کۆمەڵگەی کوردەواری و کۆمەڵەگەی خێزانی کورد برووخێنن و دواتریش لە ناوی ببەن، چونکە ئەوان باش دەیانزانی کە خێزان و ئافرەتی کورد تا چ ڕادەیەک پابەندن بەو ئەرکانەی کە لەسەر شانیانە و تا چ مەودایەکیش جێبەجێیان دەکەن. ڕێکخراوی (MEW) (چاودێری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لە ساڵی ۱۹۹۲ لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ ئافرەتێکی گوندی شێخ حەمیدی قەزای دوزخورماتو گەیشتۆتە ئەو ڕایەی (کە پاش گرتنی خەڵکەکە ژن و پیاو لە یەکتر جیاکراونەتەوە ئینجا پیاوەکان بۆ شوێنی نادیار گواستراونەتەوە، دواتریش بەهەمان شێوە ژن و منداڵەکانیان).[١]

سووکایەتی کردن بەڕەوشت و کەرامەتی ئافرەتان و ئازاردانیان دوور لە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤایەتی یەکێک بووە لە ئامانجە هەرە سەرەکییەکانی ڕژێمی عێراق لە ئۆپەراسیۆنی ئەنفالدا، (وە کاتێک پیاو و ئافرەتەکان لە یەکتری جیاکراونەتەوە، جەلادەکان دەستدرێژیان کردۆتە سەر نامووسی ئافرەتەکان و تەعدایان لێکردوون).[٢]

ئافرەتیکی هەڵاتووی عەرعەر دەڵێت: (ڕۆژی وا هەبووە دوانزە پیاو هاتوونەتە لام و دەستدرێژیان کردۆتە سەر نامووسم).[٣] ڕێکخراوی (MEW) لەو بڕوایە دایە کە (دەنگوباسێکی زۆر ترسناک هەیە کەوا لە بارەی کۆمەڵێکی گەورەی کچی عازەبەوە دەدوێ گوایە بەجیا لە

(١) دکتۆر ڕەشاد میران، م. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣).
(٢) تیشکێک لەسەر ئەرکە و ناڵەی بەناو ئەنفالەکان، لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا، زنجیرە (١) لاپەڕە (٩).
(٣) هەمان سەرچاوە، زنجیرە (٣)، لاپەڕە (١٠).

بەندییەکانی تر دایانناون و بەردەوام ئەمنەکان دەستدرێژیان کردوونەتە سەر، هەروەها باسی ئەمەش هەیە کە یەکێک لەو ئافرەتانە لە ئەنجامی ئەم کارەدا خۆی بەچەقۆیەک کوشتووە، دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتی بەندکراو لە عێراقدا لە هەموو شوێنێ زیاتر بەڵگەی بەدەستەوەبووی هەیە و تەنانەت وا زانراوە کە لەسەر کاسێتی ڤیدیۆش تۆمار کرا بێت)[1] هەروەها ئافرەتێکی دەربازبووی گوندی قیرچە لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ MEW دەڵێت (من خەفەت بۆ ئەو ئافرەتە گەنجانە دەخۆم چونکە نازانین چیان بەسەر هاتووە، ئەوان زۆر جوان بوون، باشە چ گوناهێکیان هەبوو).[2] کە بێگومان ناوەرۆکی ئەم قسانە زۆر مانا لەسەر ئەو تاوانانە هەڵدەگرێت کە دەرهەق بەئافرەتی کورد ئەنجام درابێت، ئەوەی جێگای قێزلێبوونەوەیە کە ڕژێم ئەنجامی دابێت ئەوەیە کە وێڕای سووکایەتی کردن بەئافرەتان و ئازاردانیان ڕژێم کەوتە مامەڵە و سەودایەکی تر ئەویش فرۆشتنی ئافرەتان بووە، هەروەک چەرخەکانی ناوەڕاست و کڕین و فرۆشتنی بەندە (عبد) و گەڕانەوە بۆ سیستەمی (عبودیة).

لەم بارەیەوە زۆر بەڵگە هەن کەوا ئەفسەرەکانی سوپای عێراقی هەڵساون بەفرۆشتنی ئافرەتی کورد تەنانەت بۆ وڵاتانی دەرەوەش بەتایبەتی وڵاتانی کەنداو، (کنعان مکیة) دەڵێت: (بەر لەوەی بڕۆمە باکووری عێراق گوێبیستی گەلێک چیرۆکی سەیر و سەمەرە و نامۆ دەبووم وەک ئەوەی ئافرەتە کوردەکان چۆن لە بازاڕە پەرتوبڵاوەکانی کەنداو فرۆشراون)[3] هەروەها باس لە ڕووداوێک دەکات کە (شوفێرێکی کورد لە ڕێگای بەغدا - عومان کاری کردووە کاتێک ئۆتۆمۆبیلەکەی لە ڕێگای نزیک شاری ڕومادی لە کار کەوتووە دوو ئافرەتی کورد لێی نزیک بوونەتەوە و بەزمانی کوردی لە گەڵیدا دواون و داوایان لێکردووە

(۱) MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٠٣).
(۲) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٤٢).
(۳) کنعان مکیة، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦٠).

بیانگەیەنێتە سلێمانی، پاش گفتوگۆ لە نێوان نافرەتەکان و شوفێرەکە پێیان گوتووە کە ئەوان لە کاتی شالاوی ئەنفالەکان ساڵی ١٩٨٨ دەستگیرا کراون و ئەفسەرێکی سوپای عێراقی فرۆشتوونیەتە شێخی عەشیرەتێک لە ڕومادی).[١١]

نافرەتە گیراوەکان جۆرەها ئازاری لەش (تعذیب جسدي) دراون سووکایەتی و ئیهانەیان پێکراوە ئەو چاوپێکەوتنانەی کە ڕێکخراوی (MEW) لەگەڵیان ئەنجامی داوە کە کاتی خۆی گیراون و لە لێبوردنە گشتییەکەی ٦/ ٩/ ١٩٨٨[*] ئازاد کراون ئەو ڕاستییانە دەردەخەن. لە یەکێک لەو چاوپێکەوتنانە کە لەگەڵ نافرەتێک ئەنجامدراوە دەڵێت: (سەربازێکم بینی ناوی بەعبدالقادر عبەالله دەبرا کە پیاوی حەجاج[**] بوو تاقمێ نافرەتی گەنجی دابووە بەر شەق و تێهەڵدان و بەسۆندەی پلاستیکیش هاتبووە وێزەیان ئەم نافرەتانە تازە لە دبسەوە هاتبوون)[٢] تەنانەت (حەجاج کاتێک نافرەتێکی حامیلەی ببینیبایە بەو سۆندەیەی دەستی لە سکی ئەو نافرەتەی دەدا و دەیگوت ئەمانە لاو و زۆڵە کوردن)[٣] هەروەها زۆر لە دیمەنی ترسناک و جەرگبڕی تر کە بەندییەکان لە بەندیخانەکانی ڕژێمیان بینیوە وەک نافرەتی بەقژ هەڵواسراو کە

---

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٦١).

(*) لە ٦/ ٩/ ١٩٨٨ ڕژێمی عێراق بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی (عفو عام)ێکی ساختەی دەرکرد، زۆربەی ئەوانەی کە بڕوایان بەو بڕیارە کرد و خۆیان تەسلیم بەڕژێم کرد شوێنبزر کران و لەناوبردران.

(**) حەجاج: گەنجێکی کەتەی کەچەڵ، کەسێکی ترسناکی قێزەونی سەر بەبارەگای ئەمنی بەغدا بووە، بەرپرسی بەندیخانەی نوگرە سەلمان بووە، لە دڕندایەتی کردن و ئازاردانی بەندکراوەکان ناوبانگی دەرکردبوو، بڕوانە (MEW) لاپەڕە (٤٠٢).

(٢) MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٠٣).

(٣) تیشکێک لەسەر ترکە و ناڵەی بەناو ئەنفالەکان، سەرچاوەی پێشوو، زنجیرە (١) لاپەڕە (٦).

مـــەمكيـــان بڕابوّوه يان چاويان هەڵكوّڵرابوو نينوّكـــەكـــانيـــان هەڵكيّشرابوو). [1]

شـاهيـد عـەيانێكى تر لە بەنديخـانەى نوگـره سـەلماندا دەگـێـڕێتـەوە و دەڵێت: (لە چرقـەى گـەرماى هاويندا ڕۆژانە يەک دوو ئافـرەتيـان ئەهێنا دەرەوە و بەعـەمـودەكانى ناو حەوشـەى بەنديخانەكە هەر لە بەيانى تاكـو نيـوەڕۆ ئەيانبـەسـتنەوە هەتا ئەبووراننەوە و نەدەبوايە كـەسـيش نزيكيـان بكەوێتـەوە شـەوانيش كە سـەربازەكـان سـەرخۆش دەبوون بەزۆرى لوولەى چەک و لە ژێر هەڕەشەدا گۆرانيان پێدەگوتن و هەڵپەڕكێيان پێدەكرن) [2]

وێڕاى ئازاردانى لەش، ئافرەتە بەندكراوەكان ئازارێكى دەروونى ئێجگار زۆر دراون بۆ نموونە بەوە ئازار دەدران كە نەياندەزانى چى بەسەر مێرد و برا و باوكيـان هاتووە، يان نەياندەهێـشت مـردووەكـان بەڕێز و حـورمـەتەوە بنێژرێن كە ئەوەش كارى دەكردە سەر دەروونى زيندانييەكان و لە ئاخەوە دەيانڕماندن. ڕێكخراوى (MEW) لەسـەر زارى ئافرەتێک دەگێڕێتەوە كەوا (لە پاش چەند هەفتەيەكى كەم مێردەكەم لە باوەشمدا مرد، ئەو تا دەهات باريک و بنێس دەبوو پاسەوانەكانى بەنديخانە زۆر بەخراپى داركاريیان كـردبوو، لاشـەكـەى شـەو و ڕۆژێک لە قـاوشى بەنديخـانەدا مـايەوە و پاسـەوانەكـان نەيانهـێـشت بينێژن و زۆريان لێ پاڕامەوە بەلام كـاردێک ڕێک و ڕەوان وتى لاشەكە دەبێ لە بەنديخانەدا بمێنێتـەوە تا دەگەنێ) [3] لايەنێكى ديكەى ئەم كارەساتە كە گرفتێكى كۆمەلايەتى ئێجگار گەورەيە كێشـەى هەزاران ئافرەتى جوان و حجێڵە كە تەمەنيان بچووكە و خۆيان مـاون و پيـاوەكـانيـان يان دەسـتـگيـرانەكـانيـان ئەنفـال كـراون و بێ سەروشوێنن، لەبەر ئەوە ستەمێكى گەورەيە، كە بەم شێوەيە بمێننەوە چونكە

---

(1) هەمان سەرچاوەى، زنجيرە (1)، لاپەڕە (7).

(2) عەدالەت تالەبانى، سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (68).

(3) MEW، سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (399-400).

له ڕووی یاسایی و شەرعەوە (ئایین) ڕێگایان لێ گیراوە و تاوەکو ئێستاش بەپیاوەکانیان بەستراونەتەوە. هەڵبەتە پشتگوێخستن و ئەورووژاندنی ئەم بابەتە (ڕۆژ بەڕۆژ مەترسی زێتر دەبێ و گیروگرفتی کۆمەلایەتی لێ پەیدا دەبێت، بۆیە چار نییە هەر دەبێ ئەم مەسەلەیە قسەی لێوە بکرێ و بەدوای چارسەری شەرعی و کۆمەلایەتی خۆیدا بگەڕێین)[1].

بۆیە لەم ڕوانگەوە هەر وەک سەرۆک مەسعود بارزانی لە تەلاری پەرلەمانی کوردستاندا لە مایسی ساڵی (١٩٩٩) ئاماژەی پێکرد کە دەبێ ڕێگاچارەیەک بۆ ئەو ئافرەتانە ببینرێتەوە و چیتر بەم شێوەیە نەمێننەوە، ئێستاش ئەرکی حکومەتی هەرێمی کوردستانە کە ڕێگاچارەیەکی گونجاو و لەبار لە ڕووی شەرع و یاساوە بۆیان بدۆزێتەوە چونکە مانەوەیان لەم حاڵەتەی ئێستایان زیاتر بارودۆخی ژیان و گوزەرانیان ئاڵۆزتر دەکات و بەرەو بارێکی ناهەموارتریان دەبات.

لە نیسانی هەمان ساڵ پەرلەمانی کوردستان ڕێگاچارەیەکی گونجاو و لەباری لە ڕووی شەرع و یاساوە بۆ کەسوکاری ئەنفالکراو و بێ سەروشوێنەکانی کوردستان دەرکرد[*] ئەوەی جێگای باسکردنە ئەو بەندیخانە تایبەتیانەن کە بۆ ئافرەتانی گیراو تەرخان کرابوو، دوای ئەوەی ڕژێمی عێراق هاوڵاتیانی دەستگیر دەکرد چەندین شوێنی تایبەتی ئامادە کردبوو بۆ کۆبوونەوە و دەستبەسەرکردنیان لەوانەش چەندین بەندینخانە بوون، ڕژێم بۆ ئەوەی ئازاری دەروونی پیاوەکان بدات هەڵسا بەبەندکردنی ئەو ئافرەتانە ئەویش دوای ئەوەی کە لە پیاوەکانیان دادەبڕاندن بۆ ئەو

(١) د. محمد احمد گەزنەیی، حکم زوجات المفقودین فی کارثە مایسمن بالانفال، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین هەولێر، لاپەڕە (١٠٣).

(*) جێگای باسە لە ١٩٩٤/٤/٢٤ پەرلەمانی کوردستان بۆ ئەم مەبەستە بڕیارێکی سەبارەت بەم مەسەلەیە دەرکرد بەناوی یاسای بزربووەکان لە هەڵمەتەکانی لەناوبردنی بەکۆمەڵی گەلی کوردستانی عێراق، بڕوانە پاشکۆکان.

شوێنەیان دەبرد یەکێک لەو بەندینخانانە بەندینخانەی ئافرەتان بوو لە (دبس).

ئەم بەندینخانە لە سەربازگەی دبس بوو کە پێیان دەوت (فێرگەی شەڕکەر - مدرسة قتال)، هێزی کۆماندۆی عێراق (مغاویر) مەشقیان تیادا دەکرد ژمارەیەکی زۆر لەم ئافرەتانە بۆ ئەم بەندینخانەیە گوێزرابوونەوە، دوای ئەوەی خزم و کەس و کارە بەتەمەنەکانیشیان بۆ بەندینخانەی شوومی نوگرە سەلمان بردبوو، و پیاوەکانیشیان کە لە هەموو شتێک دامالین تەنانەت جلوبەرگیشیان پێ داکەندبوون بەرەو چارەنووسێکی نادیاریان بردن.

بەپێی هەندێک سەرچاوە و زانیاری وا پێدەچێت لەو بەندینخانەیە کە دوو بینا و کۆمەڵە خانوێک بوو نزیکەی (٧٠٠٠) حەوت هەزار بەندی ئافرەت و منداڵی تیادا بووبێت، ئەو بەندیانە ماوەی چوار تا پێنج مانگ لەو شوێنەدا ماونەوە و دوای ئەوەی شالاوەکانی ئەنفال کۆتایی پێهات ئازاد کران.

هەر چەندە ئافرەتەکان لە بارودۆخێکی نێجگار دژوار و سەختدا ژیاون بەڵام جیاوازی هەبوو کە لەوە و پێشتر لە تۆپزاوە بینیبوویان لە ڕووی هاتوچۆ و خواردن و نوستن و بەکارهێنانی حەمام و خۆ شتن و ئاودەست.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەندیخانەکە ترس و سامێکی نێجگار زۆری هەبووە، بەڕێوەبەری ئەم سەربازگەیە کە هاولاتییەکی کورد بووە و بەحاجی ئەحمەد فەتاح ناوبراوە و گوایە حەجی مەککەی کردبوو، ئەو منداڵانەی کەمێک هەراش بوونە و توانیویانە هەڵبسووڕێن و تاقەتی ئیش و کارکردنیان هەبووە، فەرمانی بەپاسەوانەکان دەدا کە بەزۆر و لەژێر زەبر و لێدان قاوش و ئاودەستەکانیان پێ پاک بکەنەوە، منداڵێکی تەمەن چواردە ساڵ کە لەگەڵ ئافرەتەکاندا پێنج مانگی لە بەندینخانەی دبسدا بەسەر بردبوو باس لە چۆنیەتی مامەڵە و کرداری کاربەدەستانی

بەندینخانەکە دەکات و دەڵێت: (ئەمن و ئیستخبارات و بەعسییەکان چاودێرمان بوون و هەمیشە دەهاتن و بەبێ هۆ بەندییەکانیان فەلاقە دەکرد، ئەوان چەند جارێک دەستیان بەستوومەتەوە و لێیان داوم، جارێکیان سێ ئەمن بەدار پشت و قاچمیان دارِزاند. لەو قاوشەشدا کە تیایادا دەخەوتم دوو جار لە بەیانییەوە تا شەو بەستمیانەوە بێ ئەوەی بهێڵن هیچ بخۆم، من ئەمدەتوانی و بۆم ئەبوو بپرسم بۆچی و هیچ کەسیش ئەیدەتوانی بەربەرچی یاسای بەعس بداتەوە).[1]

مەرگەسات و ئەهامەتی بەندییەکان ئەوەندە جەرگبڕ و دڵ سووتێنە لە باس نایەت، دەبێت چ لەوە ناخۆشتر و کارەساتتر هەبێت کە جەرگی خۆت لەبەر چاوانت بمرێت بەڵام هیچ دەسەڵاتێکت نەبێت کە بیکەی تەنانەت بشینێژی؟ ئەو حاڵەتانە بەسەر زۆربەی زۆری بەندییەکاندا هاتووە و ئەم واقیعە تاڵەیان چێشتووە. لە ماوەی ئەو پێنج مانگەدا ئەوەی منداڵی بچووک بووە لەو بەندیخانەیەدا مردوون. لاشەکان لەلایەن پاسەوانەکانەوە دەبرانە دەرەوە و دەشاردرانەوە، جاری واش هەبوو خەڵکی شارەکە لە مزگەوتەکاندا کۆ دەبوونەوە و ئەو لاشانەی کە دەهاتنە مزگەوت دەیانبردە گۆڕستان و دەیان ناشتن.

وا پێدەچێت زۆربەی ئەو بەندیانە وەخت نا وەخت گوێزرابنەوە چەند شوێنێکی ترەوە، هەر وەک شایەدعەیان بینیویانە کە چەند جارێک هەندێک پاسی داخراو دەچوونە ناو بەندینخانەکە و ژمارەیەکی زۆریان لە بەندییەکان بار دەکرد و بۆ شوێنی نادیار دەیانبردن کە زۆربەیان خەڵکی ناوچەی کەلاری باشووری گەرمیان بوون، هەندێکیشیان گوێزراونەتەوە بۆ بەندینخانەی نوگرە سەلمانی باشووری عێراق.

هەروەها بەندینخانەیەکی تر هەبووە کە تایبەت بووە بە بەساڵاچوو و بەتەمەنەکان کە لە نوگرە سەلماندا بووە، وا پێدەچێت کە سەرجەم

(١) MEW، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨٤-٣٨٥).

بەندییەکانی ئەم بەندینخانەیە لە سەردەمی ئەنفالدا (٦-٨) هەزار کەس بوو بێت، بەڵام هەندێک زیاتر لەو ژمارەیە دەخەملێنن و بە(١١) یازدە هەزار بەندی دادەنێن کە تەمەنیان لە نێوان (٥٠-٩٠) ساڵدا دابووە.

سەرجەم بەندییەکان هی قۆناغی یەکەمی ئەنفال بوونە، یەکەم جار ئەوانەی کە لە ناوەڕاستی نیسانی ١٩٨٨دا گەیشتن هەزاران گیراوی گوندەکانی قەرەداغ و گەرمیان بوون، پاشان لە سەرەتای مانگی مایسدا ژمارەیەکی لەوە کەمتر لە خەڵکی بەتەمەن لە دۆڵی زێی بچووکەوە گەیشتبوون، لە دواییدا کە کۆتایی مانگی هاوین بوو چەندین پاس ژن و منداڵی خوارووی گەرمیانیان لە بەندینخانەی دبسەوە هێنا. بەندینخانەی نوگرە سەلمان مردنێکی لەسەرەخۆ بووە چونکە لە هەموو ڕوویێکەوە بەندییەکان بەرەو مردن دەچوون، ڕاستتر نوگرە سەلمان دۆزەخێک بووە بەخۆیەوە، یەکێک لە گیراوانی ئەوێ دەڵێت ئەگەر ئێوە دۆزەختان بیستووە ئەمە دۆزەخ بوو ئێمە بینیمان. بەندینخانەیەکی تر کە تایبەت بووە بەئافرەتان بەندینخانەی (سەلامییە) بوو کە لە بنەڕەتدا سەربازگەیەک بووە لە شارۆچکەی بچووکی سەلامییە کە ماوەی چەند میلێک لە باشووری موسڵەوەیە لەسەر ڕۆخی ڕۆژهەلاتی دیجلە، ئەو گیراوانەی کە هێنابوویانە بەندینخانەی سەلامییە هەموویان خەڵکی بادینان بوونە خواردنی ڕۆژانەیان نانی ڕەق و ئاوی تانکی گەرم بووە، نوستنیشیان لەسەر چیمەنتۆ ڕووتەکەی ناو قاوشەکان بووە بەبێ ڕایەخ و پێخەف هەروەها بواری یەکتر بینینی نێوان بەندییەکان بەهیچ شێوەیەک نەدراوە کە هاموشۆی یەکتری بکەن، لەبەر ئەوەی داو و دەرمان و تیمارکردن نەبووە حاڵەتی مردن بەرەو زۆری چووە ڕاستتر بارودۆخی بەندینخانەی سەلامییە لە بارودۆخی بەندینخانەی دبس و نوگرە سەلمان باشتر نەبووە مەگەر لە ڕووی هەندێک جیاوازی بچووک نەبێت.

ئافرەتەکان زیاتر ئازاری دەروونیان ئەوە بووە کە نەیانزانیوە برا و باوک و مێردەکانیان چارەنووسیان بە چی گەیشتووە، هەر چەندە ئەم

بەندینخـانەیە تایبـەت بووە بەئافـرەت و منداڵەکـانیـان بەڵام دەنگوباسی ئەوش هەبووە کـە لە قـاوەشی تری بەندینخـانەکـەدا بەندی پیـاویش هەبوویێت، ئافـرەتێکی خـەڵکی ناحیـەی گـولی لە ڕێگەی سـەربازە پاسـەوانەکـانەوە زانیـبـووی کـەوا مـێـردەکـەی و سێ برای مـاون لەو بەندینخـانەیەن، هەروەها ئافـرەتێکی تر کە لەگەڵ زینـدانیـانی خـەڵکی ناوچەی سـەرسـەنگدا لە قـاوەشی ژمـارە حەوتدا بووە بینیـبـووی کـەوا لە قاوشەکەی بەرامبەریاندا هەندێک پیاوی چاو بەسـتراوە و هەر دوو دەسـت لە پشـتـەوە شەتەکدار هەن، کـەوا هەموویان پشـتـێنی کوردیان بەسـتـوە و جەمەدانیـشیـان لەسەر دابووە هەروەها ئافرەتەکە ئەوشی بینیوە کەوا چۆن پیـاوەکـانیـان کـردۆتە ئەو ئۆتۆمـبـێلە داخراوانەی کە تەنهـا لە دواوە یەک کونیان هەبووە.

# بەشی هەوتەم

## ئەنجام و کاریگەرییەکانی پرۆسەی ئەنفال لەسەر باری کۆمەڵایەتی

### ئافرەتی کورد

پرۆسەی بەدی ئەنفال وێڕای قاتوقڕ کردنی گەلی کورد و وێرانکردنی کوردستان و تێکدانی ژێرخانی ئابووری، گەلێک دەردەسەری و نەخۆشی کۆمەلایەتی لە دوای خۆی بەجێهێشت کە تاوەکو ئێستاش پاشماوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بەدەستیانەوە دەناڵێنن، ڕاستە ئەم پرۆسەیە گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری بەبێ جیاوازی گرتەوە، بەلام هەر وەک لەمەو پێش ئاماژەمان پێکرد ئافرەت بەشی هەرە زۆری ئەو نەهامەتی و دەردەسەرییانەی بەرکەوت بەتایبەتی دوای ئەوەی کە ڕەوانەی ئۆردوگا زۆرەملێکان کران ئەویش بۆ مردنی لەسەرەخۆ و تێکدانی ڕەوشی کۆمەلایەتی و شکاندنی کەسایەتییان بەهەموو جۆرێک.

چونکە بەپێی ئامارێک هاتووە کە (٨٨٪ ئەو ئافرەتانەن کە پیاوەکانیان ئەنفال کراوە ئەوەش ئەوەمان بۆ ڕون دەکاتەوە کە ڕێژەی پیاوی خێزاندار زۆر زیاتر لە ئافرەتی خێزاندار ئەنفال کراوە و شوونبزر کراون، چونکە سیاسەتی ڕژێمی عێراق مەبەستی لەناوبردنی گەنجی کوردە بۆ ئەوەی هێزی بەرهەمهێنی کوردستان لە ڕەگوڕیشەوە هەڵتەکێنێ، ڕژێم دەیزانی ئەگەر پیاوەکان ئەنفال بکات ئافرەتە خێزاندارەکان شوو ناکەنەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دابونەریتی کورد کە شەرمە ئافرەتی خاوەن منداڵ شوو بکاتەوە، بەتایبەتیش ئەگەر چارەنووسی مێردەکەی بزر بێت. ڕژێمی عێراق بەم کارەی هێزی بەرهەمهێنی مرۆیی لەناوبرد، هەروەها خێزانی ئەو ئەنفالکراوانەی لەبەر یەک هەڵوەشاندەوە، هەروەها ڕژێم مەبەستی دروستبوونی دیاردەی بەدڕەوشتی و بێ سەرپەرشتی بوو لەناو کۆمەڵی

کوردەواری). [١] لەو بەشەدا - کە دوابەشی لێکۆڵینەوەکەیە - باس لەو دیاردە و گیروگرفت و نەخۆشییە کۆمەڵایەتییانە دەکەین کە باڵیان بەسەر کەسوکاری ئەنفالکراوەکان داکێشاوە بۆ ئەوەی ئاگاداری بارودۆخی ژیان و هەڵسوکەوت و چارەنووسیان بین...

**یەکەم: نەخۆشییە دەروونییەکان**

نەخۆشییە دەروونییەکان (بریتین لە کۆمەڵێک دیاردەی پەشۆکی و هەڵچوون کە لە مرۆڤدا دەردەکەوێت ئەم پەشۆکی و هەڵچوونانە هۆکارێکی ئەندامی دیاریکراوی نییە لە لەشی مرۆڤدا بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دەروونی مرۆڤ و ئەشتوانین بڵێین هەستێکە حەوانەوەی مرۆڤ تێکدەدات). [٢]

زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین نەخۆشییە دەروونییەکانی ئافرەتانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بەڕێژەی نەخۆشییە جەستەیی و لەشییەکان یەکسانن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش لە زیادبووندایە ئەگەرچی تاوەکو ئێستا بەپێی زانیاری نووسەر لێتوێژینەوەیەکی دروست و ئامارێکی سەرتاسەری لەمەڕ ئەو نەخۆشیانە ئەنجام نەدراوە.

بەڵام ئەگەر سەرنجێکی ورد بدەینە ڕوخساری کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و تەندروستیان بکۆڵینەوە ئەوا بەئاشکرا ئاسەواری ئەو نەخۆشیانە بەدیاردەکەوێت. لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا توێژەرێک لە کۆی (١٥٠) خێزان کە زۆربەیان ئافرەتن ئەنجامی داوە (٤٧) خێزان دوچاری نەخۆشی دەروونی وەک دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، ترس، لەهۆش چوون هتد هاتوون) [٣] کەوا لە خوارەوە باسیان دەکەین.

---

(١) یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٥).

(٢) محەمەد کەریم شەیدا، نەخۆشییە دەروونییەکان و دەروون لەشییەکان (سایکۆماتی)یەکان، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٠، لاپەڕە (٥).

(٣) یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٧).

أ- دڵەڕاوکێ:

دڵەڕاوکێ جۆرێکە لە هەڵچوونی دەروونی و تاڕادەیەکی زۆر لە ترس دەچێت لە کاتی ترسناکیدا و ئەمەش دەم دەم ڕوودەدات یان بەشێوەیەکی هێواش دەست پێدەکات ئینجا وردە وردە زیاد دەکات، دڵەڕاوکێ کەس لێی ڕزگار نابێت و هەموو کەسێک دوچاری دەبێت بەکەم و زیادەوە ئافرەت زیاتر دووچاری دەبێت وەک لە پیاو بەڕێژەی ٢٪ بۆ ١٪ لە لێکۆڵینەوەکەی پێشوودا هاتووە کە لە (٨،٥١) خێزان دووچاری دڵەڕاوکێ هاتوونە کە ئەوەش ڕێژەیەکی زۆرە بەبەراورد لەگەڵ هەندێک لە نەخۆشییە دەروونییەکانی تر کە توێژەر ئەنجامی داون). [1]

ب - ترس، تۆقاندن Phapiestate:

ترس حاڵەتێکی دەروونییە کە مرۆڤ تووشی دەبێت و یەکێکە لە حاڵەتەکانی دڵەڕاوکێ یان پەرچدانەوەی هۆکارێکی دیار، وەک ترس لە تاریکی و شوێنی داخراو و سواربوونی هۆکانی گواستنەوە، فڕۆکە، کەشتی، شەمەندەفەر یان ترس لە شوێنی بەرز، هەر لە لێکولینەوەکە دەرکەوتووە کە (١٠،٦٣٪) خێزان تووشی ترس هاتوون[2] کە ئەوەش بێگومان دەرەنجامی ئەو هەموو جەور و ستەم و زەبر و قینەیە کە ڕژێم بەرامبەر بەگەلی کوردی ئەنجامداوە، چونکە بێ بەزەیی و دڕندەیی ئەو ڕژێمە و تاوانە بێ وێنەکانی بووەتە هۆی خولقاندنی حاڵەتێک لە تۆقاندن کە ئەوەش بێگومان لە نەوەیەک بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە.

ج- لە هۆش چوون، پەرکەمی (الصرع)

نەخۆشییەکی دەمارییە بریتییە لە پەشۆکی کاتی لە فەرمانەکانی دەماغدا کە بوورانەوەی لەگەڵدایە ئەم پەشۆکییەش شیاوی دووبارە

---

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢١٧).

(٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢١٧).

بوونەوەیە، دیارە ئەم نەخۆشییە دەروونییە وەک هەموو نەخۆشییەکانی تر لەلایەن کەسوکاری ئەنفالکراوەکانەوە زیاتر لەوانی تر بەدیار کەوتووە، لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە ئەوەی دەرخستووە کە لە (٦.٨٣٪) خێزان دووچاری ئەم نەخۆشییە هاتوون) و[١] ناسەوارێکی خراپیشی کردۆتە سەر باری خێزانی و دەروونی ئافرەت و کەسوکاری ئەنفالکراوەکان.

د- خەمۆکی (الكآبة):

خەمۆکی حالەتێکی دەروونی گشتییە تووشی هەموو چین و توێژێک دەبێت، ئەم نەخۆشییە لە کاتی تەنگانە و ناخۆشی و لێقەوماوی و نەهامەتی و خەم و خەفەتدا دوچاری مرۆڤ دێت (ئەم حاڵەتەش ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندایە بەتایبەتی لەو وڵاتانە کە گۆڕانکاری خێرایان بەسەردا دێت وەک ناوچەی کوردستان کە لە بارودۆخێکی تایبەتدا دەژی).[٢]

هەر لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە کە (١٠.٦٣٪) خێزان دوچاری خەمۆکی هاتوون)[٣]. کە بێگومان ئەو ڕێژەیە بەهۆی ئەو بارە ناهەموار و دژوارەی کە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان تیایدا دەژین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووناندیە و چاوەڕوانی چارەسەرێکی خێرا و کتوپڕی لێ ناکرێت.

هـ- لەبیرکردن (النسیان):

زۆر جار ڕووداوی دڵتەزێن و ناخۆش و کاریگەر دەبێتەوە هۆی لەبیرکردن، ئەم حاڵەتە دەروونییە کار دەکاتە سەر مێشک لە ئەنجامی زۆر لێکۆڵینەوە، وەک مردنی خۆشەویستێک یان یادکردنەوەی ڕووداوێکی دڵتەزێن کە دەبێتە هۆی خورپەیەکی دەروونی کە کاردەکاتە سەر مێشک و دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوە ئەمە (٨.٥١٪) خێزان لە کۆی (٤٧) خێزان کە

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢١٧).

(٢) محەمەد کەریم شەیدا، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٨).

(٣) یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٧).

لێکۆڵینەوەکەیان لەسەر ئەنجامدراوە دوچاری لەبیرچوونەوە هاتوون).[1]

ئەمانە و گەلێک دیاردە و گیروگرفتی دەروونی تر وەکو (دڵتەنگی، شێت بوون، تووڕەبوون، زۆر بیرکردنەوە... هتد) کە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان دورچاری هاتوون و تاوەکو ئێستاش بەدەستیانەوە دەناڵێن و ئەگەر لە ڕێژەی تووشبوان بەگرفت و نەخۆشییە عەقڵی و دەروونییەکان ورد بینەوە، ئەوا ڕێژەکەیان نیجگار بەرزە چونکە ئەگەر لە کۆی (١٥٠) خێزان لەناو (٤٧) خێزاندا تووشی گرفت و نەخۆشی دەروونی هاتبن ئەی دەبێ ئەم ڕێژەیە لە (١٨٢) هەزار شوونبزرکراو و ئەو هەموو کەسوکارە بەجێماوەیان چەند بێت؟ کەواتە شاڵاوەکانی ئەنفال لە ڕووی دەروونییەوە کارێکی زۆر خراپی بووە لەسەر ئەندامانی خێزانە ئەنفالکراوەکان بەتایبەتی و ئەندامانی کۆمەڵ بەگشتی، ئەم گرفت و نەخۆشییە دەروونییانە کوشندەیی شاڵاوەکان پێشان دەدات لە میانەی ئازاردانی جەستەیی و دەروونی).

## دووەم: دیاردە و گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان

ئۆپەراسیۆنی ئەنفال هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ شڵەژان و پەرتەوازە بوونی کۆمەڵگەی کوردەواری و تێکدانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان یەکتریدا، هەروەها بووە هۆی نەهێشتن و تێکدانی دابونەریتی ڕەسەنی کوردەواری کە بنچینە و بنەمای سەرەکین بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی. نەخۆشی و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی پاشماوەی ئەنفال گەلێک زۆرن لەوانە:

أ- سەرپەرشتیاری خێزان:

بێگومان هەر وەک لە پێشەوە باسمان کرد کە خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵە و کۆمەڵیش لە ڕێگای ئەوەوە دەتوانێت زۆر لە ئەرک و مافەکانی

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢١٧).

بەجێ بێنێت و کاتێک سەرپەشتیاری ئەو خێزانە بەهەر هۆیەک بێت نەمێنێت ئەوا سیستەمی بەڕەتی دووچاری بارێکی ناارامی و ناجێگری دەبێت لە دوایبدا ئاسەوارێکی خراپی بەسەردا دێت. ئەگەر بەراوردێک لە نێوان باری خێزان و سەرپەرشتیاری بکەین لە پێش ڕوودانی شاڵاوەکانی ئەنفال و دوای ڕوودانەکەش ئەوا هەندێک ڕاستیمان بۆ بەدیار دەکەوێت کە سەرپەرشتیاری خێزان ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی هەیە لە پێشخستن و سەرکەوتنی خێزاندا. (لە پێش شاڵاوەکانی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ سەرپەرشتیاری خێزان ڕێژەی (٨٩،٣٣٪) لە ژێر دەسەڵاتی باوک بووە بەرامبەر (٨٪) کە لە ژێر دەسەڵاتی دایک بووە، بەڵام ئەم ڕێژەیە لە دوای شاڵاوەکانی ئەنفال گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە کە بووەتە لە (٣٣،٦٦٪) لە ژێر دەسەڵاتی باوک و دایکیش ڕێژەی (٦٢،٦٦٪) بەرکەوتووە[1] ئەوەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ڕێژەی باوکان زۆر بەر شاڵاوەکە کەوتوونە بەرامبەر بەڕێژەی دایک، بۆیە دەبینین هەموو ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان کەوتۆتە سەر شانی دایک و، دایک بوەتە سەرپەرشتیاری ماڵ و هەر لە پەروەردەکردنی منداڵ و ئیشوکاری ناوماڵ و کارکردنی لە دەرەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانە کە ئەوەش بوەتە هۆی تێکچوون و شلەژانی خێزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و گۆڕانی سیستەمی پەروەردەیی تیایدا.

ب- لە دەستدانی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی

هەر کۆمەڵگەیەک کە شلەژا و بەردەوام نەمان چوو ئەوا بێگومان زۆر لە بنەما سەرەکییەکانی لە دەست دەدا یان گۆڕانی بەسەر دادێت، شاڵاوی ئەنفال کە بناغە و پرانسیپە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری تێکوپێک دا کاری کردە سەر دابونەریتی ڕەسەنی کوردەواریش بەجۆرێک کە بەڕێژەی لە (٥٩،٣٣٪) خێزانەکان دوای گۆڕانی شوێنی دانیشتن و

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٢٠-٢٢١).

لەبەر دابڕانیـان لە خزم و کەسـوکـاریان بەناچاری وازیان لە دابونەریتی ڕەسەنی خۆیان هێناوە و پەیڕەوی دابونەریتی کۆمەڵایەتی ئەو شوێنە دەکەن کە تێیدا نیشـتەجێ کراون، هەر چەندە کۆسپ و گیروگرفتیان تووش هاتووە و تووش دێت، تاکو خۆیان لەگەڵ ئەم ڕەوشە نوێیەدا دەگـونجێنن، ئەمەش ئامـانجێکی گـرنگی ڕژێم بووە لە پلان دانان و پیـادەکـردنی شـاڵاوەکـانی ئەنفالدا بەرامبەر بەخەڵکی گوندنشـینی ناوچەکانی کوردسـتان کە خاوەن دابونەریت و کـولتـووری ڕەسـەنی ئەتەوەیی بوون و مـەیدانی نموونەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان بوون.[١]

ج- دیاردەی نەخوێندەواری

ئاشکرایە نەخوێندەواری کوشندەترین نەخۆشییە کە دوچاری کۆمەڵ دێت و بەهۆیەوە ئەم کۆمەڵە دوادەکەوێت و لە ڕەوتی کۆمەڵگەکانی تر دادەبڕێ. بەشێوەیەکی گشـتی ئافرەتی کورد نەخوێندەوارە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دابونەریت و عـەقلییـەتە دواکـەوتووەی کـە کـۆمـەڵگەی کوردەواری بەسـەر ئافـرەتی داسـەپاندووە، شـاڵاوەکـانی ئەنفـال زۆر دیاردە و نەخـۆشی کۆمەڵایەتی لێ کەوتەوە، نەخوێندەواریش یەکێکە لەو دیاردانەیە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە لە ئەنجامی شاڵاوەکاندا بەسەر خـێـزانی کـورد داهات بۆ نموونە هەژاری، گـۆڕینی جـێـوشـوێن، بێ سەرپەرشـتیـاری خێزان... هتد، هەموویان فـاکـتەری سـەرەکین کـە وایان کـردووە کـەسـوکـاری ئەنفالکراوەکـان بەنەخوێندەواری بمێننەوە، هەروەها ئەوەشمـان لەبیر نەچێت کە ڕژێمی عێراق هەردەم هەوڵی داوە گەلی کورد بەنەخوێندەواری بهێڵێتەوە، تاوەکو لە ڕووی پێشکەوتن و پەرەپێدانی کـۆمـەڵایەتی و ڕۆشنبـیـریەکـان بەدواکـەوتوویی بمێنێتـەوە و لە ڕەوتی کۆمەڵگەکان دابڕێ لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە کە ڕێژەی نەخوێندەواری لە خێزانی ئەنفالکراوەکـان لە (٨٨.٦٦٪)ە کـە بەرزترین ڕێژەیە بەرامـبەر

---

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٢٦).

بە(٤.٦٦ ٪) کە خوێندەوارن (بەمانای ئەوەی دەزانن بخوێنن و بنووسن) لە کاتێکدا لە (٤.٦٦ ٪) خاوەن بڕوانامەی سەرەتایین، بەڵام ئەوانەی بڕوانامەی ناوەندییان هەیە ڕێژەکەیان (٢ ٪)ە[1] دیارە ئەمەش گیروگرفتێکی ئێجگار گەورەیە کە پێویستە لێکۆڵینەوە و چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، چونکە مانەوەی ئەم ڕێژە بەرزە لەناو ئەم کەسوکارانە دەبێتە هۆی دروستبوونی نەوەیەک کە (خوو) بەنەخوێندەواری بگرێت. بێگومان زۆر لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی تر باڵیان بەسەر کەسوکار و خێزانی ئەنفالکراوەکان کێشاوە کە لەوانەیە چارەسەرکردنیان کاتێکی زۆر دەخایەنێ.

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٩٤).

## ئەنجام

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەکرێ ئەنجامە سەرەکییەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە لێک بدەینەوە:

**یەکەم**: پرۆسەی ئەنفال یەکێکە لە گەورەترین و دڕندانەترین تاوان - وێرای زنجیرە تاوانەکانی تر - کە دەرهەق بەنەتەوەی کورد ئەنجامدرابێت، بێگومان ئامانجی سەرەکی ڕژێم تیایدا پاکتاوکردنی نەژادی و برانەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤی کورد بووە.

**دووەم**: ئەم تاوانە نامرۆڤانەیە کاریگەرییەکی نێجگار گەورەی کردە سەر نەتەوەی کورد بەگشتی و تاکی کورد بەتایبەتی هەروەها زەرەروزیانێکی زۆریشی بەهەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری بەبێ جیاوازی گەیاند.

**سێیەم**: بێگومان (توێژی ئافرەتان) لە پێشینەی هەمووان دێت، چونکە دوای ئەنجامدانی ئەم تاوانە هەموو ئەرکەکانی کۆمەڵگا هەر لە پەروەردەکردنی منداڵ و نیشوکاری ناوماڵ و کارکردنی لە دەرەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانە کەوتە سەرشانی ئافرەت بەوەی کە ڕێژەی پیاوەکان زیاتر بەر شاڵاوەکە کەتوون بەرامبەر بەڕێژەی ئافرەتان، بێگومان ئەوەش ئامانج و مەبەستی سەرەکی ڕژێم بوو بۆ ئەوەی خێزانی کورد پەرتەوازە بکات و ئافرەتەکانیش دیاردەی ناموێی و دوور لە دابونەریتی کۆمەلایەتی بکات.

**چوارەم**: وێرای زەرەروزیانی گیانی پرۆسەی ئەنفال کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر ژێرخانی ئابووری کوردستان و دوچاری ئیفلیجی و شلەژانی کرد، چونکە ئاشکرایە گوند و دێهاتەکان کە سەرچاوەی بنەڕەتی داهاتی کوردستانن گشتی وێران کران و لەناوبردران بەمەش ئابووری کوردستان ڕووی لە کزی کرد و بەرەو هەڵدێر چوو.

**پێنجەم**: تاوانی بەدی ئەنفال گەلێک ئەخۆشی و دیاردەی کۆمەلایەتی لێ

کەوتەوە کە ئەمەش بێگومان کاریگەرییەکی نێجگار گەورەی کردە سەر دابونەریت و ڕەوشت و خەسڵەتە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری و بووە هۆی لە دەستدانی هەندێک لەو بنەما سەرەکی و پتەوانەی کە لە کۆمەڵگەدا بەدی دەکران.

**شەشەم**: هەروەها ناسەواری تاوانی ئەنفال بووە هۆی بڵاوبوونەوەی کۆمەڵێک گرفت و نەخۆشی دەروونی و عەقڵی کە تووش بووان و پاشماوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان تا وەکو ئەمڕۆ بەدەستیانەوە دەناڵێنن ئەمە وێڕای نەخۆشی جەستەیی و کەم ئەندامی لەشی کە ڕێژەیەکی زۆر دووچاری هاتوون.

**حەوتەم**: ئامانجی سەرەکی پرۆسەی ئەنفال پەیڕەوکردنی سیاسەتی ڕاگواستن و تەعریب بوو، بۆیە دەبینین لە دوای ئەنجامدانی تاوانەکە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان کەوتنە بەر شاڵاوی ڕاگواستن و تەعریب کران، ئەمەش مەبەستی سەرەکی ڕژێمی عێراق بوو بۆ گۆڕین و شێواندنی سروشتی کوردستان لە ڕووی جوگرافی و دیمۆگرافییەوە.

## پێشنیار و ڕاسپاردەکان

ئاشکرایە دوا بەدوای ئەنجامدانی پرۆسەی بەدی ئەنفال کۆمەڵی کوردەواری هەر وەک لە پێشەوە باسمان کرد - دووچاری کەلێک گیروگرفت و تەگەری ناخۆش بۆوە، کە ئەمەش وای کرد بارودۆخ ڕەوشێکی تایبەتی بەسەر پاشماوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان دابێت و دوچاری حاڵەتێکی نالەبار و ناسەقامگیریان بکات، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە پێویستە ستراتیژیەتێکی تایبەت بۆ چارەسەرکردن و نەمانی ئەم ڕەوشە نالەبارە بدۆزرێتەوە و نەخشە و پلانی گونجاو و لەباری بۆ دابڕێژرێت و تیایدا هەوڵبدرێت ناسەوارەکانی ئەم تاوانە بنبڕ بکرێت یاخود هەر نا بتوانرێت کەم بکرێتەوە بێگومان ئەم ئەرکەش دەکەوێتە سەرشانی هەموو کەس و لایەنێک بۆ ئەوەی بەئەرکی نەتەوایەتی خۆیان هەڵبستن و ئەم کارە ئەنجام بدەن.

**یەکەم:** لە سەرەتادا پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان مشوورێکی جدیانە لەم گیروگرفتە بخوات و لایەنە پەیوەندیدارەکانی ئەم بابەتە هەوڵ بدەن کە ڕێگاچارەی گونجاو بدۆزنەوە بۆ ئەوەی ئاسەوارەکانی ئەنفال بەرەو نەمان بچێت و لە ئێش و ئازارەکانی کەم بکرێتەوە.

**دووەم:** پێویستە تاوانی ئەنفال بخرێتە خانەی قڕکردنی بەکۆمەڵ (جینۆساید) و هەوڵبدرێت لە ڕێگای دیبلۆماسییەتی کورد و نوێنەرانی حکومەتی هەرێم لە دەرەوە ئەم بابەتە لە کۆڕ و کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکان بورووژێنرێت و مەزلومییەتی گەلی کورد بۆ جیهان ڕوون بکرێتەوە و ئەوانەش کە دەستیان لە ئەنجامدانی ئەم تاوانە بێ وێنەیە هەبووە، بدرێنە دادگای نێودەوڵەتی (تاوانەکانی جەنگ - محکمة جرائم الحرب) و تاوانبارانیش وەکو تاوانباری جەنگ (مجرمي الحرب) مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و بەسزای خۆیان بگەن، کە دەبینین ئەمڕۆ چۆن تاوانبارانی هەموو دنیا و لە هەر کوێیەک بن وا بەم چارەنووسە دەگەن.

**سێیەم:** داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان (UN) بکرێت کە لیژنەیەکی تایبەت و ڕەسمی بۆ کوردستان بنێرن بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیکیانە لەم تاوانە بکۆڵنەوە و بەچاوی خۆیان پاشماوە و ئاسەوارەکانی ببینن و لە چارەنووسی دەیان هەزار مرۆڤی کوردی شوونبزرکراو ئاگاداربن، لەم بارەیەوە دڵنیاین کە نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵگەنامە و زانیاری تەواو و پێویستیان لە بەردەستدایە بۆ بەکارهێنانی.

**چوارەم:** هەوڵ بدرێت داوای قەرەبووکردنەوە بۆ پاشماوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بکرێت کە زۆربەیان منداڵ و پیر و پەککەوتەن ئەویش لە ڕێگای داهاتی ١٣٪ی نەوت بەرامبەر بەخۆراک کە بۆ هەرێمی کوردستان تەرخان کراوە و بڕێک پارە بەشێوەیەکی ڕەسمی دابنرێت هەر تا بۆ ئەوەی لەو ئەهامەتی و دەردەسەرییەی کە تیایدا دەژین یارمەتی ژیان و گوزەرانیان بدات کە ماوەی ١٤ ساڵە بەدەستییەوە دەناڵێنن.

**پێنجەم**: پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەهەماهەنگی لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و مرۆییەکان کە لە کوردستاندا کار دەکەن هانی ئەو خەڵکە بدەن کە کاتی شاڵاوەکە لە گوند و دێهاتەکانیان وەدەرنراون بۆ زێدی باب و باپیرانیان بگەڕێنەوە، هاوکات پێویستە حکومەت هەموو پێداویستی و ناسانکارییەکان لە ڕووی (ماددی و مەعنەوی) بۆ دەستەبەر بکات و کارە خزمەتگوزارییەکانیان بۆ دابین بکات بۆ ئەوەی بتوانن دووبارە کاروباری خۆیان ڕێک بخەنەوە و سەرلەنوێ خانووبەرەکانیان بنیاد بنێنەوە. ئەمەش بێگومان سوودێکی باش بەژێرخانی ئابووری کوردستان دەگەیەنێت.

**شەشەم**: پێویستە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن (لە دەرەوە و ناوەوە) لە دەرخستن و نیشاندانی ئەم تاوانە دەستەوەستان نەوەستن و ڕاستییەکان بۆ جیهان ڕوون بکەنەوە بەتایبەتی حاڵی حازر کە خاوەنی کەناڵی ئاسمانین و بەئاسانی دەتوانین دەنگ و ڕەنگمان بگەیەنینە هەموو کونوقوژبنێکی دنیا.

حەوتەم: پێویستە (سەنتەری ئەنفال) کە وەکو دەزگایەکی ستراتیژی بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ئەنفالکراو و بێ سەروشوێنەکانی کوردستان دامەزراوە زیاتر یارمەتی لە هەموو ڕوویێکەوە بدرێت و کۆمەک بکرێت، تاوەکو بتوانێت بەئەرکەکانی خۆی هەڵبستێت و زیاتر زانیاری لەمەڕ ئەم تراژیدیایە کۆ بکاتەوە و بەدیکۆمێنتیان بکات.

# پاشکۆ

## شاڵاوەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامەکانی ڕژێمدا
## یاسای بزر بووەکان

بەزەیی نامەیەک

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سەرۆکی فەرماندەی بەڕێز و شکۆدار سەددام حوسێن (خوا بیپارێزێ)، سەرکۆمار و سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی بەڕێز:

هەڤاڵی تێکۆشەر، دەستی ڕێز و ئەوازشت بۆ بەسینگەوە دەگرم و وەک هاووڵاتییەکی دڵسۆز لە ڕێگەتدا خۆم بەخت دەکەم.

بەناوی دادپەرستیی بەعسییەوە تکات لێ دەکەم گوێ لە دەرد و مەینەتیم بگرە، کەوا شەووڕۆژ خەوی لێ زڕاندووم لەبەر ئەوەی هیچ هیوایەکم نەماوە و لە ئێوە بەولاوە کەسی دیکەم نییە پەنای بۆ ببەم، وا ئەم کێشەیەم دەخەمە بەر دەمتان کە ڕەنگە پەیوەندییەکی پێتانەوە هەبێت.

گەورەم:

من کە لە خوارەوە ئیمزام کردووە ناوم (عاسی مستەفا ئەحمەد)ە، سەربازی یەدەگم و لە دایکبووی ١٩٥٥م. لە ٢٤ی ئابی ١٩٩٠دا وەک دیلێکی جەنگ گەڕامەوە.

من لە شەڕی قادسیەی سەددامی شکۆداردا لە کەرتی شووش بەشداریم کردووە و لە ٢٧ی ١٩٨٢ دا بەدیل گیرام و بەبەندیی مامەوە تا ئەو ڕۆژەی بڕیاری دیلی جەنگ گۆڕینەوە دەرچوو، پاشان گەڕامەوە بۆ خاکی نیشتمان و خۆڵی نیشتمانی دایکم ماچ کرد و لەبەردەم وێنەی سەرکردەی سەرکەوتوومانداسەرۆک سەدام حوسێن کرنۆشم برد، لە دڵی خۆشمدا هەستم بەپەرۆشییەکی بێ پایان دەکرد بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە لای خێزانەکەم، چەندە ئەوان شاگەشکە دەبوون بەبینینم و چەندە منیش خۆشحاڵ دەبووم بەدیداریان و هەمووومان نوقمی خۆشی و شادییەک دەبووین ئەوسەری نەبێتەوە و لە باسکردن نەیەت.

بەڵام وا نەبوو و هاتمەوە ناو ماڵی چۆڵوهۆڵ، ژنەکەم و مندالەکانم لەوێ نەبوون، ئای کە چ بەڵایەک بوو! ئای کە چ دەرد و خاوێک بوو! پێیان وتم تەواوی خێزانەکەم کەوتوونەتە بەردەستی هێزەکانی ئەنفال لە عەمەلیاتی

ئەنفالدا کەوا لە ناوچەی باکووردا بەڕێوەچووە، بەفەرماندەیی هەڤاڵ علی حسن المجید. من هیچ لە بارەی چارەنووسیانەوە نازانم، کەسانی خیزانەکەم ئەمانەی خوارەوەن:

١- عەزیە عەلی ئەحمەد، لە دایکبووی ١٩٥٥، خێزانم.
٢- چرۆ عاسی مستەفا، لە دایکبووی ١٩٧٩، کچمە.
٣- فەرەیدوون عاسی مستەفا، لە دایکبووی ١٩٨١، کوڕمە.
٤- ڕووخۆش عاسی مستەفا، لە دایکبووی ١٩٨٢، کوڕمە.

بەم جۆرە ئەم داواکارییەم دەخەمە بەردەستتان و ئومێد دەکەم بەزەییتان پێمدا بێتەوە و لە بارەی چارەنووسیانەوە ئاگادارم بکەنەوە، داواکارم لە خوا سەرکەوتن و پارێزگاریتان بۆ ڕەوا ببینێ و لە منیشەوە سوپاس و ڕێز

ئیمزا - دیلی جارانی جەنگ

سەربازی یەدەگ- عاسی مستەفا ئەحمەد- بێ ماڵ و بێ داڵدە، لە سلێمانی- چەمچەماڵ

گەڕەکی بێکەس- مزگەوتی حاجی ئیبراهیم

٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٠

## وەڵام

بەناوی خوای بەخشندەو و میهرەبان

کۆماری عێراق - دیوانی سەرۆکایەتی

ژمارە: ش ع/ب/٤/ ١٦٥٦٥ - مێژوو / ١٠ ربیع الثانی/ ١٤١١هـ

٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٠

بەڕێز/ عاسی مستەفا ئەحمەد

پارێزگای سلێمانی- قەزای چەمچەماڵ- گەڕەکی بێکەس- مزگەوتی حاجی ئیبراهیم

ئاماژە بەداواکارییەکەت لە ٤/ ١٠/ ١٩٩٠، ژنەکەت و منداڵەکانت لە سەردەمی عەمەلیاتی ئەنفالدا، کەوا لە ساڵی ١٩٨٨ لە ناوچەی باکووردا ئەنجامدرا، ون بوون.

ئیمزا - سعدون علوان مصلح

/٠ سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی

بسم الله



الجمهورية العراقية
ديوان الرئاسة

العدد / ش ع / ٣ / ٤ / ٦٥ / ١٦٥٦٥
التاريخ / ٢٠ / ربيع الثاني / ١٤١١ هـ
٩ / ١٠ / ١٩٩٠م

السيد غازي مصطفى احمد
محافظة السليمانية / قضاء جمجمال
محلة / ... / محمد حسن ابراهيم

تلقت رسالتك في ٤ / ١٠ / ١٩٩٠م
في زوجتك واولادك فقدوا أثناء عمليات الانفال
التي جرت في المنطقة الشمالية عام ١٩٨٨ .
مع التقدير .

سعدون علوان مصلح
د. رئيس ديوان الرئاسة

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

| وەزارەتی بەرگری | نەتەوەیەکی عەرەبی یەکگرتو |
| --- | --- |
| سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا | خاوەن پەیامێکی نەمر |

سەرکردایەتی فەیلەقی یەک

لە/ سەرکرایەتی فرقەی (٢) هێزی خالید بن وەلید

بۆ/ سەرکردایەتی فەیلەقی یەک

ژمارەی نووسراو — مێژووی نووسراو
١٦٩ — ١٩٨٨/٤/١٥

(٠) تکایە (٨) هەشت فرۆکەی هەلیکۆپتەر و (٢٠) ئۆتۆمۆبیلی بارهەلگر دابین بکەن بۆ گواستنەوەی لیوای (٣٩) لە ناوچەی پیرەمەگروون بۆ ناوچەی

قەرەداغ لەگەڵ دابینکردنی هێزی پاراستنی ئاسمانی لە کاتی ئەنجامدانی کردارەکە کە ڕۆژی ٢٠/٤/١٩٨٨ دانراوە بۆ ئەنجامدانی (٠). کۆتایی هات.

ئیمزا - عەمیدی ڕوکن - عەدنان ناجی

سەرۆکی هێزی خالید بن وەلید

١٩٨٨/٤/١٥

بسم الله الرحمن الرحيم



وزارة الدفاع
رئاسة اركان الجيش
قيادة الفيلق الاول

امة عربية واحدة
ذات رسالة خالدة

من / قيادة فـ ٢ ـ قوات خالد بن الوليد
الى / قيادة فـ ١

رقم القيد: ١٢٩

تاريخ الانشاء: ١٩٨٨/٤/١٥

(٠) يرجى تأمين (٨) ثمانية طائرات هليكوبتر مع ٢٠ عشرون سيارة حمل لنقل اللواء ٣٩ من منطقة بيوه مكون الى منطقة قرداغ مع طلب تأمين حماية جوية للعملية التي تم تحديدها يوم ٢٠/٤/١٩٨٨ لتنفيذها (٠) انتهى

العميد الركن
عدنان ناجي
قائد قوات خالد بن الوليد
١٩٨٨/٤/١٥

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

وەزارەتی بەرگری | نەتەوەیەکی عەرەبی یەکگرتو
سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا | خاوەن پەیامێکی نەمر

سەرکردایەتی فەیەلقی یەک

لە/ فەیلەقی یەک

بۆ/ سەرکردایەتی گشتی هێزی چەکدارەکان

ژمارەی نووسراو     مێژووی نووسراو

١٤٢     ١٩٨٨/٤/٢٠

(٠) لە کاتی پاککردنەوەی ناوچەی قەرەداغ (٢٥٠٠) دوو هەزار و پێنج سەد تێکدەر و بەکرێگراو لە ژن و پیاو گیراون لەگەڵ دەستبەسەر داگرتنی هەندێک چەک و تەقەمەنی لە ناوچەی قوپی قەرەداغ کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە.

١- ١٠ ■ ناریپچی/ ٧

٢- ٢٠٠ دوو سەد کلاشینکۆف.

٣- ١٠٠٠ هەزار رومانە.

(٠) ئێستا گیراو و چەک و تەقەمەنییەکان لە بارەگای فەیلەق دان لەم بارەیەوە چاوەڕێی ڕێنمایەکانتانین (٠). کۆتایی هات.

ئیمزا - لیوا روکن سولتان هاشم

سەرۆکی فەیلەقی یەک

١٩٨٨/٤/٢٠

بسم الله الرحمن الرحيم

وزارة الدفاع
رئاسة اركان الجيش
قيادة الفيلق الاول

امة عربية واحدة
ذات رسالة خالدة

من / ف ١

الى / القيادة العامة للقوات المسلحة

م

رقم القيد: ١٤١     تاريخ الانشاء: ٢٠/ ٤/ ١٩٨٨

(٠) اثناء تمشيط منطقة قرداغ تم القاء القبض على عدد [illegible] من الرجال والنساء مع الاستيلاء على قطع الاسلحة والاعتدة [illegible] في منطقة [illegible] قرداغ

١ ـ ١٠ [illegible] آر بي جي ٧
٢ ـ ١٠٠ [illegible] كلاشنكوف
٣ ـ ١٠٠٠ الف [illegible]

(٥) تم الاحتفاظ بالاسلحة [illegible] في مقر الفيلق [illegible] توجيهاتكم [illegible] ذلك (٠) [illegible]

اللواء الركن
سلطان هاشم
قائد الفيلق الاول
١٩٨٨/٤/٢٠

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

لە/سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان     نەتەوەیەکی عەرەبی یەکگرتوو

بۆ/ سەرکردایەتی فەیلەقی یەک     خاوەن پەیامێکی نەمر

ژمارەی نوسراو     مێژووی نووسراو

٢/م خ     ١٩٨٨/٤/٢٣

(.) نامـــەی نهـــێنی و بەپەلەتان ١٤٢ لە ١٩٨٨/٤/٢٠ تێکدەر و بەکرێگیراوەکان کە ژمارەیان (٢٥٠٠) دوو هەزار و پێنج سەد کەسە بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش دەکرێن. (.) پیاو ڕەوانەی سەرکردایەتی فەیلەقی (٤) دەکرێن (.) ئافرەت بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی (٣) ڕەوانە دەکرێن (+) منداڵ ڕەوانەی سەربازگەی زرێپۆش لە تکریت دەکرێن (.)

لەگەڵ نێردراوی ئێمە و بەئۆتۆمبێلی تایبەت ڕەوان دەکرێن (٠) کۆتایی هات.

ئیمزا م/خ سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان
١٩٨٨/٤/٢٣

بسم الله الرحمن الرحيم



من / القيادة العامة للقوات المسلحة
الى / قيادة الفيلق الاول

امة عربية واحدة
ذات رسالة خالدة

رقم التخصيص
٢ م/ خ

تاريخ الانشاء
١٩٨٨/٤/٢٣

(٠) رسالتكم السرية والفورية ١٠٦ في ٢٠/٤/١٩٨٨
بين المخربين والعملاء البالغة عددهم / ٢٥٠٠ الفان
وخمسمائة على النحو التالي (٠) الرجال يرسلون الى
قيادة فق ٥ (٠) النساء يرسلون الى قيادة فيلق ٣
(٠) الاطفال يرسلون الى ... 
شكرية (٠) يرسلون بصحبة مأموري من ... و
بسيارات خاصة (٠) انتهى

م/ خ
القيادة العامة للقوات المسلحة
١٩٨٨/٤/٢٣

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

وەزارەتی بەرگری — نەتەوەیەکی عەرەبی یەکگرتو

سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا — خاوەن پەیامێکی نەمر

لە/ وەزارەتی بەرگری- هێزەی ئاسایش

بۆ: بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی سەربازی

بۆ زانیاری- سەرکردایەتی فەیلەقی۱

| ژمارەی نووسراو | مێژووی نووسراو |
|---|---|
| ٤٨ | ١٩٨٨/٤/٢١ |

( . ) داوا دەکەین لیژنەیەکی ئاسایش لە بەڕێوەبەرایەتییەکەتان بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی/١ بنێرن، بۆ ئەنجامدانی چەند ئەرکێکی تایبەت کە لە ماوەی ( ٢٠ ) کاتژمێر کۆتایی پێبێت ( . ) ئاگادارمان بکەنەوە.

هەربژین بۆ ڕاژەی حزب و شۆڕش

ئیمزا-عەمید عەبدولقادر ئەلدوری

بەڕێوەبەری هێزەی ئاسایشی سەربازی

١٩٨٨/٤/٢١

یاسای بزربووەکان لە هەڵمەتەکانی لەناوبردنی بە کۆمەڵی گەلی کوردستانی عێراق

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

بەناوی گەل

ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق

ژمارەی بڕیار: ٥

مێژووی بڕیار: ١٩٩٩/٤/٢٨

بڕیار

پشت بەو دەسەلاتەی کە بە پێی برگە (٣)ی ماددە (٢) لە یاسای ژمارە (١٠) ساڵی ١٩٧٧ پێمان دراوە و لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٩/٤/٢٤یدا یاسا کاری کرد وە بڕیاری دەرهێنانی ئەم یاسایەمان دا:

ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٩

یاسای بزربووەکان لە هەڵمەتەکانی لەناوبردنی بەکۆمەڵی گەلی کوردستانی عێراق

ماددەی یەکەم: حوکمەکانی ئەم یاسایەی بزربووەکان ئەم حاڵەتانەی خوارەوە دەگرنەوە:

١- ئەوانەی لە ماوەی هەڵمەتی کۆچ پێ کردنی کوردە فەیلیەکان لە لایەن حکومەتی ناوەندی عێراقەوە لە ساڵی ١٩٨٠دا بزر بوون، ١٩٨٠/١٢/٣١ بە مێژووی جاردانی بزربوونیان دادەنرێ و گەران بەدوای چارەنووسیان لە ڕووی هۆیەکانی و کات و مەبەستەکەی بە تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر بزربوونیاندا کۆتایی هاتووە.

٢- ئەوانەی لە ماوەی هەڵمەتی لەناوبردنی کوردە بارزانییەکان لە لایەن حکومەتی ناوەندی عێراقەوە لە ساڵی ١٩٨٣دا بزر بوون و ڕۆژی ١٩٨٣/١٢/٣١ بە مێژوویەک دادەنرێ بۆ جاردانی بزربوونیان و گەران بەدوای چارەنووسیاندا لە ڕووی هۆیەکانی و کات و مەبەستەکەی بە تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر بزربوونیاندا کۆتایی هاتووە.

٣- ئەوانەی لە ماوەی هەڵمەتی لەناوبردنی خەڵکی شاری هەڵەبجەی شەهید بەچەکی کیمیایی لە لایەن حکومەتی ناوەندی عێراقەوە کە لە ١٩٨٦/٣/١٦دا بزربوون و، ڕۆژی کارەساتەکە بە مێژوویەک دادەنرێ بۆ جاردانی بزربوونیان و گەڕان بەدوای چارەنووسیان، لەڕووی هۆیەکانی و کات و مەبەستەکەی، بە تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر بزربوونەکەیاندا کۆتایی هاتووە.

٤- ئەوانەی لە ماوەی هەڵمەتی لەناوبردن، کە پێیان دەگوترێ (ئەنفال)، لە ساڵی ١٩٨٨دا بزر بوون، ١٩٨٨/١٢/٣١ بە مێژوویەک دادەنرێ بۆ جاردانی

بزربوونیـــان و گـــەڕان بەدوای چارەنووســـــیان، لە ڕووی هۆیەکـــانی و کـــات و مەبەســـتەکەیان، بەتێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر بزربوونەکەیاندا کۆتایی هاتووە.

٥- ئەوانەی لە ماوەی ڕاپەڕینەکەی ئاداری ١٩٩١ و کۆڕەوە میلیۆنییەکەی کە بەدوای داهات بزربوون، ١٩٩١/١٢/٣١ بە مێژوویەک دادەنرێ بۆ جاڕدانی بزربوونیان و گەڕان بەدوای چارەنووسیان، لە ڕووی هۆیەکانی و کات و مەبەستەکەیان، بە تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر بزربوونەکەیاندا کۆتایی هاتووە.

ماددەی دووەم:

أ. تێپەڕ بوونی ئەو ماوانەی کە لە ماددەی یەکەمدا هاتوون دەبنە قەرینە و بە حوکمێک دادەنرێن بۆ مردنی بزربووەکەی کە ئەم یاسایە دەیگرێتەوە.

ب. ئەگەر ژنەکە بزر بووبێت بەڵگەی وەفاتنامەی بە حوکم بۆ دەرچوو، ئەوا مێردەکەی بۆی نییە خوشکی ژنەکەی یا ئەوانەی ناتوانێ لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی کۆیان بکاتەوە بیهێنێ تاکو بەتەواوی چارەنووسەکەی دیار دەکەوێت.

ماددەی سێیەم:

أ. دادگای تایبەت بەڵگەی مردنی ئەو بزربووەی کە ئەم یاسایە دەیگرێتەوە دەردەچوونێ لەسەر داوایەکی پێشکەش کراو لە لایەن یەکێک لە خزمەکانی تاکو ڕادەی پلەی چوارەم و ئەوەش دوای پەیداکردنی بەڵگەی شایەدییە، لە لایەنێکی کارگێڕیی تایبەت، کە پشتگیریی بکات و دەستنیشانی یەکێک لەو حاڵەتانە بکات کە بزربووەکە دەگرنەوە و لە ماددەی یەکەمی ئەم یاسایەدا هاتوون.

ب. لەکاتی نەبوونی خاوەنی پەیوەندیی لەو پلانەی کە لە برگە (١) باس کراون، لەم بارەدا هەمـوو خـاوەن بەرژەوەندییـەک یان لایەنێکی حکومـەتی بۆیان هەیە دوای دەرچواندنی بەڵگەی وەفاتنامە بەپێی ئەوانەی سەرەوە بکات.

ماددەی چوارەم: دادگای شوێنی دانیشتنی داواکاری بەڵگە وەفاتنامە یان شوێنی بوونی ئەو لایەنە حکومەتییەی کە داوای بەڵگەکە دەکات، بە دادگای تایبەتمەندی دەرچواندنی بەڵگەی وەفاتنامەی بزربووەکە دادەنرێ، کە ئەم یاسایە دەیگرێتەوە، هەروەها قەسامی شەرعی یاسایی کە بەپێی بەڵگەی ناوبراو دەرچوێنراون ئەمەش بە دەرە لە حوکمەکانی برگەی یەکەمی ماددەی (٣٠٥)ی دادگاییکردنی شارستانی ژمارە (٨٣)ی ساڵی ١٩٦٩.

ماددەی پێنجەم: ڕۆژی دەرچواندنی بەڵگەی وەفاتنامە بەمێژوویێک دادەنرێت بۆ مردنی ئەو بزربووەی کە ئەم یاسایە دەیگرێتەوە وەک حوکمێک و، ژنی بزربووەکەش پێویستە خۆی بە (عیددەی مردن) ببەستێتەوە کە چوار مانگ و (دە) ڕۆژە لە مێژووی دەرچوونی بەڵگەکەوە.

ماددەی شەشەم: لە بارێکدا کە ئیسپات بوو لەپاش دەرچوونی بەڵگەی مردنەکەی، بزربووەکە زیندووە، ئەوا حوکمەکانی ماددەی یەکەمی یاسای باری کەسایەتی ژمارە (١٨٨) ی ساڵی ١٩٥٩ی هەموار کراو و حوکمەکانی یاسای چاودێری ناکامڵەکانی (قاصرین)ی ژمارە (٧٨)ی ساڵی ١٩٨٠ی بەسەردا دەسەپێنرێ.

ماددەی حەوتەم: بەڵگەی ئەو وەفاتنامەیەی کە بەپێی ئەم یاسایە دەرچووە، دەکەوێتە بەر رێگەکانی تانووت لێدان کە لە فەسڵی دووەم و ماددەی (٢١٦)ی یاسای دادگاییکردنی شارستانی ژمارە (٨٣)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراودا هاتوون.

ماددەی هەشتەم:

١. دوو دینار رەسم لە تۆمارکردنی بەڵگەی وەفاتنامە وەردەگیرێ کە بەپێی ئەم یاسایە دەرچووە.

٢. بەڵگەی وەفاتنامەی دەرچوێنراو لە رەسمی پوول و ئەو غەرامەیەی کە لە یاسا کارپێکراوەکاندا هاتووە دەبووردرێ.

٣. قەسامی شەرعی و یاسایی کە بە گوێرەی بەڵگەی وەفاتنامە رێکخراون و بەپێی ئەم یاسایە دەرچوون، لە رەسمەکانی دادوەری دەبووردرێن.

کار بەهیچ دەقێکی یاسایی ناکرێت کە لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا ناکۆک بێت.

ماددەی دەیەم: دەبێ وەزارەتەکانی داد و ناوخۆ رێنمایی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی ئەم یاسایە هەر یەکەیان بەپێی تایبەتمەندی خۆی دەربکات.

ماددەی یازدەیەم: دەبێ ئەنجوومەنی وەزیران حوکمەکانی ئەم یاسایە جێبەجێ بکەن.

ماددەی دوازدەیەم: ئەم یاسایە لە رۆژی دەرچوونییەوە جێبەجێ دەکرێت و لە رۆژنامەی رەسمیشدا بلاو دەکرێتەوە.

**جوهر نامق سالم**

**سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق**

# سەرچاوەکان

## أ/سەرچاوەکان بەزمانی کوردی:


١- قورئانی پیرۆز

٢- ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکۆچکەی بەعسیان، تەرحیل تەعریب تەبعیس، چاپی دووەم سلێمانی.

٣- ئیسماعیل بێشکچی، کوردستان کۆلۆنیەکانی نێودەوڵەتی، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە ڕێبوار ڕەشید، هەولێر/ ١٩٩٣.

٤- برهان قانع، بنچینە کۆمەڵایەتییەکانی ئافرەتی لادێ نشینی کوردەواری، بەغدا - ١٩٧٩.

٥- تیشکێک لەسەر نرکە و ناڵەی بەناو ئەنفالەکان، لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا.

٦- (MEW)، جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، وەرگێرانی سامەندی موفتی زادە، سلێمانی - ١٩٩٩.

٧- جیاکاری دژی ژن، ناوەندی مافەکانی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەولێر - ٢٠٠٠

٨- حوسێن محەممەد عەزیز، کورد و شۆڕش و هەڵی مێژوویی، سلێمانی - ٢٠٠٠

٩- د. ئەحمەد بابکر میراودەلی، لە گازبارانکردنی هەڵەبجەدا کێ تاوانبارە، گۆڤاری سەرخۆبوون، ژمارە (٨،٧) هاوین و پایزی- ٢٠٠١.

١٠- د. ڕەشاد میران، یوسف دزەیی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (١٩)ی بەهاری ٢٠٠١.

١١- د. کەمال مەزهەر، ئافرەت لە مێژوودا، کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی، بەغدا - ١٩٧٩.

١٢- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٦٩) ڕۆژی ١٧/٤/ ١٩٩٢.

١٣- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە (٤٣) ڕۆژی ٧/ ١٠-١ ایلول، ٢٠٠١

١٤- ڕاپۆرتی ASK بۆ مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان ساڵی ٢٠٠٠، چ (١) - ٢٠٠١

١٥- زیاد عەبدولرەحمان، تونی مەرگ، هێرشەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامەکانی ڕژێمدا، تەوریز - ١٩٩٥.

١٦- ستران عەبدوللا، ڕازەكانی تەعریب و ڕاگواستن
١٧- شیلان مستەفا، ئافرەت و ڕۆڵی كاریگەری لە كۆمەڵدا، گۆڤاری قەرەچوغ ژمارە (٥) بەهاری - ٢٠٠٠
١٨- گۆڤاری ئەنفال، ژمارە (١)، سالی ٢٠٠٠.
١٩- گۆڤاری بەربانگ، ژمارە (٨٧) سالی ١٢، ستوكهۆلهم، ١٩٩٣
٢٠- گۆڤاری هەفتەنامەی گولان ژ (٢١٨)، ڕۆژی ١٩٩٩/٣/٢٠
٢١- عەبدوللا كەریم مەحموود، چارەنووسێكی نادیار، چەند دیمەنێك لە ئەنفالەكانەوە - ١٩٩٣.
٢٢- عەلی بەندی، ئەنفالكرنا بەهدینان، چ (١) دهۆك، ٢٠٠١
٣٢- فەرید ئەسەسەرد، كورد و مەسەلەكانی ئەمنی قەومی.
٢٤- فەیسەڵ دێهاتی، كورد لە سیستەمی نوێی جیهاندا، كوردستان هەولێر - ٢٠٠١
٢٥- مەحموود مەلا عززەت بازنەكانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەیی كورد - ١٩٩٨
٢٦- مەلا شاخی، ئەنفالی خالخالان، سلێمانی - ٢٠٠١
٢٧- محەمەد كەریم شەیدا، ئەختوشییە دەروونییەكان و دەروون لەشییەكان (سایكۆماتی)یەكان، سلێمانی - ٢٠٠٠
٢٨- نەجات حەمید، گۆڤاری دەنگی ئافرەت، ژمارە (١٥)، سالی ١٩٩٨.
٢٩- هەژاری عەزیز سورمێ، كورد و جینۆساید و ئیبادەكردن، هەڵوێستی یاسایی نێودەوڵەتی - ١٩٩٨
٣٠- هیوا تاڵەبانی، بەعس و میلیتاریزەكردنی عێراق، گۆڤاری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی سیاسەتی دەولی، ژ (٢) سالی چوارەم، تەمووزی - ١٩٩٥
٣١- یوسف دزەیی، ئەنفال كارەسات ئەنجام و ڕەهەندەكانی، هەولێر - ٢٠٠١.

## ب/ سەرچاوەكان بەزمانی عەرەبی:

٣٢- ابو جعفر محمد جرير الطبري، جامع البيان عن تأويل آي القران ط٢. شركة ومطبعة مصطفى الحلبي - ١٩٥٤.
٣٣- ابو عبدالله محمد بن احمد الانصاري القرطبي، الجامع لاحكام القرآن، دار احياء التراث العربي، بيروت لبنان - ١٩٦٥.
٣٤- ابو هلال العسكري، الفروق في اللغة، ط٦، دار العربية لكتاب، ١٩٨٣.

٣٥- الامام العلامة محمد جمال الدين القاسمي، المسمى محاسن التأويل، ط١، بيروت لبنان - ١٩٦٥.
٣٦- خليل بن احمد الفراهيدي، كتاب العين، ط٢، مؤسسة دار الهجرة - ١٩٩٠.
٣٧- د. محمد احمد گقزنةبي، حكم زوجات المفقودين في كارثة ما يسمى بالانفال.
٣٨- د. نوال السعداوي، الانثى هي الاصل، المؤسسة العربية للدراسات والنشر.
٣٩- رضا زيبر زيباري، الانفال والرحلة الشاقة، دهوك - ١٩٩٥.
٤٠- قسم الاعلام في المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكردستاني العراق، من جرائم القتل العام في كوردستان عام ١٩٨٨، شباط - ١٩٨٩.
٤١- كنعان مكية، القسوة والصمت، الحرب والطغيان والانتفاضة في العالم العربي، أربيل - ١٩٩٦
٤٢- محمد احسان، كوردستان ودوامة الحرب، دار ئاراس للطباعة والنشر ط٢، اربيل كوردستان - ٢٠٠١

# پێرست